HR.MKT.00441.00067.002

| HR.MKT | 00441.00067 | 8 موحەررەم 1280 (25 حوزەیران 1863) |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی عالی والی بەغداد و جەنابی موشیری لەشکری شەشەمی هومایۆن پاپاسە فەرەنسیەکان لە عەمادیە خانەیەکی بە کرێ گیراو نۆژەن دەکەنەوە، لە ١ موحەررەم ١٢٨٠ بە پۆستە نووسراو هاتووە و هاوپێچەکان خوێندنەوەی بۆ کراوە و لە کۆتایی زیلحیجە ١٢٧٩ وەڵام بە تەلەگرافنامە هاتووە و بە پاشا راگەیەندراوە، ئەوەی لە نووسراوەکە باسکراوە لە تۆماری پۆستە دووبارە بە پێویست نەزانراوە ئەفەندم. | | |


i. MVL. 537/24/29

4

İ.MVL.00537

| İ.MVL | 00537.024129 | 6 موحەڕرەم 1282 (1 حوزەیران 1865) |
|---|---|---|

ژمارە ٥
پایەی پەیوەندیداری سەدارەتی عالی
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
جاسم بەگ لە بەگزادەکانی عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ لەلایەن میریەوە مولکی دەست بەسەر کراوە، لە بەرامبەر ئەم مولکە لە سندوقی دارایی موسڵ پارەی بۆ دابین کرابوو، بەڵام بەهۆی مردنیەوە بری ٣١٥ قوروش مووچەی مانگانەکەی بێ خاوەن ماوەتەوە، مووچەکەی بۆ خێزانەکەی عەزیزە خانم و کوڕەکەی سەعدوڵلا بەگ و کچەکانی فەلەك ناز خانم و ماهنور خانم بە شێوەیەکی یەکسان دابین بکرێت، مەزبەتەکان لە ئەنجوومەنی موسڵ و بەغداد ڕێکخراوە و پێشکەشی جەنابی پەیوەندیداری وەکالەتی عالی کراوە، جێبەجێ کردنی پەیوەستە بە سەروو، لە هەر حاڵەتێکدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.
مۆری محەمەد نامق موشیری لەشکری شەشەم و والی بەغداد



İ.MVL.00558



İ.MVL.00558

<table dir="rtl">
<tr><td>İ.MVL</td><td>00558.025048</td><td>25 ڕەبیعی یەکەم 1283 (7 ئۆغستۆس 1866)</td></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی میهرەبانی ئەفەندم<br>لە مەزبەتەی ڕاگەیەندراوی ئەنجوومەنی واڵا ڕوون بۆتەوە، عەلی خان بەگ لە بەگزادەکانی عەمادیە مردووە، مووچەکەی ٣٠٠ قوروش بێ خاوەن ماوەتەوە، نیوەی مووچەکەی ١٥٠ قوروش بدرێتە بەگستان خانی خێزانی، ١٥٠ قوروشەکەی تریش ڕەوانی خەزینە بکرێت، نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار کراوە تا جێبەجێ بکرێت، بەڵام جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>

<table dir="rtl">
<tr><td>İ.MVL</td><td>00558.025048</td><td>9 موحەڕڕەم 1283 (24 مایس 1866)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>عەلی خان بەگ بەگزادەی عەمادیە مردووە، ٣٠٠ قوروش مووچەکەی بێ خاوەن ماوەتەوە، لەم مووچەیەدا ١٥٠ قوروش بدرێتە خێزانەکەی بە ناوی بەگستان خانم، ئەوەی دەمێنێتەوەش بدرێتە خەزینە، نووسراوی جەنابی پاشای والی بەغداد حەواڵەی ئەنجوومەنی واڵای کۆڵەکەی داد کراوە، لەگەڵ مەزبەتەی ئەنجوومەنی گەورەی ئەیالەت بۆ عالی ڕەوان کراوە، بە تێڕوانین لە ئاماژەی بابەتەکە کارەکە جێبەجێ بکرێت، بڕیار و فەرمان بۆ ئەفەندیمانە.</td></tr>
</table>




| | | |
|---|---|---|
| İ.DH | 00559.038917 | 15 شەوال 1283 (20 شوبات 1867) |

جەنابی میهرەبانی ئەفەندم

لەلایەن دانیشتوانی قەزای عەمادیە بری ١ یوك و ٢٩٩٠ و عەلی ئەفەندی ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی ئەرزروم بری ١٥٠٠ و حوسنی ئەفەندی بەڕێوەبەری پێشووی قەزای کائین کرانس سەر بە سانجەقی ئایدن بری ٦٤٠ و عەبدولحەمید ئەفەندی و سەید عەلی ئەفەندی خانەدانەکانی قەزای ئەلباق سەر بە سانجەقی وان بری ٤٣٠ قوروش دابین کراوە، بە لیستێك پارەکە ڕێکخراوە و بەخشیویانە، لە بارەی قەبوڵ کردنی ئەوراق راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکە بریار و فەرمانی جەنابی ملوکانە چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.




A.}MKT.UM.00962.00076.001

| A.MKT.UM | 00962.00076 | 19 زیلقەعدە 1283 (25 مارت 1867) |
| --- | --- | --- |
| والی ئەیالەتی بەغداد<br>ئۆغان کوڕی بارسام لەگەڵ عەلام ئەفەندی دانیشتوی قەزای عەمادیە دەیانەوێت برە پارەیەك لە قەساب تۆما وەربگرن، بۆ ئەم مەبەستە داواکارییان بەرز کردۆتەوە، بە تێروانین لەم داواکاریەی بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی بابەتەکە. | | |




A.}MKT.MHM.00437.00055.001

<table>
<tr><td>A.MKT.MHM</td><td>00437.00055</td><td>22 زیلقەعدە 1285 (6 مارت 1869</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>عەزیز بەگی مردوو لە بەگزادەکانی عەمادیە مانگانە بری ٨١ قوروش و نیو مووچەکەی بۆ براکەی حەسەن بەگ دابین بکرێت، نووسراوی رەوان کراوی ویلایەتی بەغداد لەگەڵ مەزبەتە رەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




A.}MKT.UM.01054.00018.001

| A.MKT.UM | 01054.00018 | 26 ڕەبیعی کۆتایی 1285 (16 ئۆغستۆس 1868) |
| --- | --- | --- |
| سەدارەتی پیرۆز<br>ئـەم گەندەڵیـەی لـە قـەزای عەمادیـە سـەری هەڵـداوە دەستپێشـخەری کـراوە تـا کۆتایـی پـێ بهێنرێـت، بـەڵام سـنووری هـەکاری بـە عەمادیـە بەسـتراوەتەوە، لەوێـش عەشـیرەتی خێمەنشـین هەیـە، لـە هەکاریـش ئامـادەکاری نەکرێـت ئـەوا گەندەڵـی ناوهاتـوو بـۆ هـەکاری دەگوازرێتـەوە، بۆیـە هێزێکـی سـەربازی هـەکاری بچێتـە ئـەوێ، ئـاگاداری دراوە و کار بکرێـت.<br>ئیسماعیل حەقی والی ویلایەتی دیاربەکر | | |




İ.DH.00641

| İ.DH | 00641.044628 | 8 ڕەمەزان 1288 (21 تشرینی دووەم 1871) |
| --- | --- | --- |

جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
قۆناغی حکوومەت و قەڵای عەمادیەی سەر بە سانجەقی موسڵ وێران بووە و بەم دواییە بە ناچاری نۆژەنکراوەتەوە، خەرجی نۆژەنکردنەوەکان لە پارەی باجی دە یەکی ساڵی ١٢٨٦ی لیوای ناوهاتوو خەرج کراوە و بە گفتوگۆ روون بۆتەوە ١٤٨٤ قوروش لە خەزینە قەبوڵ کراوە و هەژمارکردنی بە راپۆرتی نەزارەتی دارایی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی راپۆرتەکە رەوانی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، بریار و فەرمانی جەنابی پاشا جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.




A.}MKT.UM.01272.00033.002

<table>
<tr><th>A.MKT.UM</th><th>01272.00033</th><th>22 رەبیعی کۆتایی 1290 (19 حوزەیران 1873)</th></tr>
<tr><td colspan="3">موتەسەرفی موسڵ<br>دانیشتوی قەزای عەمادیە زەینەل بەگ بۆ گەریدە دوور خراوەتەوە، بەم دواییەش لێبووردنی بۆ دەرچووە و خەریکە لە دەرسەعادەت نیشتەجێ دەبێت، براکانی عەبدوللەتیف بەگ و یوسف بەگ لەوبەرن، پێویستی پێیان دەبێت، بۆیە داوای ئەوانی کردووە، ئەگەر بکرێت ئەوانیش بێنە لای، بۆ ئەم مەبەستە ئاسانکاریان بۆ بکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>


A.}MKT.UM.01569.00058.002

| A.MKT.UM | 01569.00058 | 18 ڕەجەب 1290 (11 ئەیلوول 1873) |
|---|---|---|

ویلایەتی بەغدادی شکۆدار
لـە بـارەی کلدانـی کاسـولیکەکانی قـەزای عەمادیـەی سـەر بـە سـانجەقی موسـڵ، لەلایـەن حالـەت ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری شـارۆچکەی داودیـە لەگـەڵ شـێخ محەمـەد نیشـتەجێی گونـدی بومازەنـە، کوردەکانـی دەورووبـەر هانـدراوە بەرامبـەر بـە کلدانیـەکان سـەرپێچیان کـردووە، بـۆ ڕێگەگـرن لـەم ڕووداوانـە لەلایـەن بریـکاری بەتریقـی کلدانـی ڕاپـۆرت ڕەوان کـراوە، بـە پەلە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و هیممەت بکرێت تا کۆتایی بـەم کارانە بهێنرێت.




A.}MKT.UM.01320.00027.003

| 24 سەفەر 1291 (12 نیسان 1874) | 01320.00027 | A.MKT.UM |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامەی ویلایەتی دیاربەکر<br>کانزای خەڵوز لە گوندی بیسکی سەر بە قەزای عەمادیەی موسڵ دۆزراوەتەوە، تا لە دواوەی شەمەندەفەرەکە هەڵدەگیرێت و کارەکە تەواو دەبێت، کانزای ناوهاتوو بپارێزرێت، ئامادەکاری پێویست ئەنجام بدرێت، بە تەلەگراف لە ویلایەتی بەغداد راگەیەندراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |


i.DH 696/48738

İ.DH.00696

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>00696.048738</td><td>11 موحەررەم 1292 (17 شوبات 1875)</td></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی میهرەبانی ئەفەندم<br>ساڵی رابردوو بەهۆی بارانەوە قۆناغی حکوومەتی شارۆچکەی عەمادیە سەر بە ویلایەتی بەغداد وێران بووە، پێویستی بە نۆژەنکردنەوە و خەرجیە، بەڵام خەرجیەکە لە خۆچێی دابین نەکراوە، لە بارەی دابین کردنی ٢٩٤٠٠ قوروش راپۆرتی نەزارەتی دارایی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت و حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.</td></tr>
</table>




| 13 رەجەب 1293 (4 ئۆغستۆس 1876) | 00031.001536 | İ.SD |
|---|---|---|

جەنابی میهرەبانی ئەفەندم

لەسەر ئەم مەزبەتەیەی لە شورای دەوڵەت ڕێکخراوە بە هاوپێچ ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە قەزاکانی عەمادیە و زاخۆی موسڵ لە ساڵی ١٢٨٣ بەدواوە پێویستە خۆراکی تەکیەکانی کەیهان و نەقشبەندی ببردرێت و شەش یەکی نەهاتۆتە خوارەوە، بۆیە لە مارتی ١٢٩٠ بەدواوە دەبردرێت، تا ئەم مێژووە کۆکراوەکەی ١٨،٣٨٦ قوروش و نیو بووە و بە میهرەبانی عالی دەبوردرێت، بەم نووسراوە جێبەجێ بکرێت و حەواڵەی نەزارەتی دارایی شکۆدار کراوە، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



DH.MKT.01319.00077.001

| 10 رەمەزان 1294 (18 ئەیلوول 1877) | 01319.00077 | **DH.MKT** |
|---|---|---|

ویلایەتی دیاربەکر و نەزارەتی دارایی شکۆدار
بەهۆی کار و جولەی نەگونجاوی یاسین ئەفەندی قائیمقامی قەزای لیجەی ناو ویلایەت دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو عارف ئەفەندی قائیمقامی عەمادیەی جیابووەوە بە مووچەی ١٣٥٠ قوروشی دابین کراو دامەزرێت، بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەران جێبەجێ بکرێت، لەم بابەتەدا فەرمانی پاشای جەنابی پاشا جێبەجێ بکرێت، چۆنیەتی بە ویلایەتی ناوهاتوو راگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە لە خەزینە بە نەزارەتی دارایی شکۆدار راگەیەندراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.

ŞD.02150.00047.003

| ŞD | 02150.00047 | 25 جەمادی کۆتایی 1295 (26 حوزەیران 1878) |
|---|---|---|
| پوختەی بابەت<br>قـەزای عەمادیـە لـە سـانجەقی موسـڵ جیابکرێتـەوە و ببەسـترێتەوە بـە هـەکاری، هەروەهـا ناحیـەی شـەمدینان کـە سـەر بـە سـانجەقی هەکارییـە وەکـو پێشـووتر هـەر بـە ویلایەتـی بەغـداد ببەسـترێتەوە. | | |




A.}MKT.UM.01645.00066.003

| | | |
|---|---|---|
| **A.MKT.UM** | 01645.00066 | **24 زیلحیجە 1296 (9 کانوونی یەکەم 1879)** |

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

٣٠٠ نەفەر بۆ عەمادیە بەکار دێن، مانگانەش بە تەخمینی ١٢٠٠٠ مووچەیان پێویستە، هەروەها لە ڕەواندز زەبتیەی کاتی دادەمەزرێن، دەکاتە ١٢،٤٠٠ قوروش مووچە، هەروەها بۆ فەرمانبەرانی نهێنیش ١٧٣٠ قوروش دابین کراوە، لەگەڵ تەلەگرافنامەی ٩ ئەیلوول ١٢٩٥ ڕاگەیەندراوە، بەڵام هێشتا وەڵام وەرنەگیراوە، ئەم مووچانەی دەدرێتە زەبتیەی کاتی لە خشتە تۆمار کراون، لەسەر ڕەزامەندی نەزارەتی دارایی شکۆدار وەستاوە، بە ووتەی ژمێریاری بریار و ڕەزامەندی داواکراوە، فەرمان.

بریکاری والی و موتەسەرفی موسڵ نازم





A.}MKT.UM.01665.00057.001

| A.MKT.UM | 01665.00057 | 8 زیلحیجه 1297 (11 تشرینی دووەم 1880) |
| --- | --- | --- |
| ویلایەتی بەغدادی شکۆدار<br>ئەم هێزە سەربازییەی بوونی هەیە، لەگەڵ ئەم تابورانەی رەوانی عەقرە و عەمادیە دەکرێت، پێویستە ئەرزاق و ئاقچە و تێچووی گواستنەوەیان دابین بکرێت، لەسەر ئاماژەی نەزارەتی جەنگی لە ویلایەتی بەغداد ئامادە بکرێت و دابین بکرێت. | | |




ŞD.02429.00022.002

| ١٤ سەفەر 1297 (27 كانوونى دووەم 1880) | 02429.00022 | ŞD |
|---|---|---|

٥٧٥

ئەحمەد ئەفەندی لەسەر کارە خراپەکانی لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە دوور خراوەتەوە، بە ووردبینی کردن لە کارە خراپەکانی، ئاماژە بە ئەنجامەکەی کراوە، لە وەڵامی ئەم ئاگاداریانەی کە بەرز کراوەتەوە لە پایەی بریکاری والی موسڵ نووسراوی مێژووی ٧ سەفەری ١٢٩٦ ژمارە ١٥ حەواڵەی قۆمیسیۆن کراوە، لەگەڵ وێنەی دوو پارچەی مەزبەتەی ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی ناوهاتوو بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بەهۆی کارە خراپەکانی ناوبراو لە مەزبەتەکانی ناوهاتوو هاتووە و بە ووردبینی کردنی بابەتەکان ئاماژەی پێ بکرێت ئایا بەکار هێنانەوەی قەدەغە دەکرێت یا قەدەغە ناکرێت، ئەوراقی ناوهاتوو حەواڵەی پایەی شورای دەوڵەت کراوە، خوێندنەوەی بۆ بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.

مۆری قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی قائیمقامەکان




ŞD.02434.00026.003

| | | |
|---|---|---|
| 24 رەمەزان 1297 (30 ئۆغستۆس 1880) | 02434.00026 | ŞD |

پوختەی بابەت

قەزاکانی عەمادیە و زێبار و عەشائیری سەبعەی سەر بە ویلایەتی موسڵ یەکیانگرتووە و کراونەتە موتەسەرفیەتێك بۆ موتەسەرفیەتەکەشی سەرۆکی تاوان عەبدولرەحمان بەگ دادەمەزرێت.



| İ.DH | 00841.067632 | 7 موحەررەم 1299 (29 تشرینی دووەم 1881) |
|---|---|---|

جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
مستەفا ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە سەر بە هەکاری دەیەکی دانەوێڵە و سەرمەڕی بە شێوەیەکی ناشەرعی و بە ئارەزووی خۆی بەڕێوەبردووە، جگە لەمە بیرومێشکی کوردەکان دەشڵەژێنێ و ئاڵۆز دەکات، تا تووشی بارودۆخی خراپتر نەبوونەتەوە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەم عەبدولرەحمان بەگ لە سەرۆکایەتی فەرمانگەی جەزای ویلایەتی ناوهاتوو جیابۆتەوە دابمەزرێت، ئەرکەکەی ناوبراو پەسەند کراوە، بەم راگەیاندنە بۆ جێبەجێ کردنی مەزبەتەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردن وەرگیراوە لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمانی پاشای جەنابی پاشا چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| İ.DH | 00844.067772 | 10 سەفەر 1299 (1 کانوونی دووەم 1882) |
|---|---|---|

جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
لـە قائیمقامیەتـی قـەزای عەمادیـەی سـەر بـە ویلایەتـی هـەکاری ئەرکەکـەی بەجـێ هێشـتووە، لەبـەر گرنگـی شـوێنی جوگرافیـش ناکرێـت قائیمقامیـەت بـە بەتاڵی بمێنێتـەوە، بۆیە لـە قائیمقامیەتـی ناوهاتوو کەسـێکی لێهاتوو رەوان بکرێـت، لەسـەر تەلەگرافـی ویلایەتـی ناوهاتـوو بـە ووردبینـی کـردن و تاقیکردنـەوە، بـە گونجـاو زانـراوە مەحمـود رەفعـەت ئەفەنـدی قائیمقامـی پێشـووی یەنیشـەهیر و هەڵبژێـردراو لـە چینـی دووەم دابمەزرێـت، بـە راگەیاندنـی ئـەم خوێندنـەوە، رەزامەنـدی نیشـان دراوە و لـە مەزبەتـەی قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران و وەرەقـەی وەرگێـردراوی کەسـێتی بەیەکـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی مامەڵەکـە، بریـار و فەرمانـی جەنابـی جیهانـدار چـی بێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.




DH.MKT.00098.00039.001

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>00098.00039</th><th>17 موحەررەم 1301 (18 تشرینی دووەم 1883)</th></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵی پایەبەرز<br>بەهۆی خراپی بەڕێوەبردنی عوسمان نوری ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە، لە قەزا تاوان زۆر بووە و ئاسایش تێك چووە، لەم بابەتەدا لەسەر هەندێك ووتە بە واژووی باڵا رەشید بەڕێوەبەری ناحیەی بەرواری پاڵا تەلەگرافنامەی بە عەرەبی لە باستکە دەرچووە، وێنەیەکی وەرگێردراوی تەلەگرافنامەکە هاوپێچ رەوان کراوە، شایەنی ئەوەیە ووردبینی بۆ بکرێت و لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت، بەپەلە و بە مەزبەتە راستی بارودۆخەکە روون بکرێتەوە و هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی.</td></tr>
</table>



İ.DH.00955

| İ.DH | 00955.075545 | 26 رەمەزان 1302 (9 تەمموز 1885) |
| --- | --- | --- |
| جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی هەکاری بە کراوەیی ماوەتەوە، دەرچووی مەکتەبی شاهانە و هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم محەمەد زیا ئەفەندی دامەزراوە، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران و وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە رەوان کراوە و راگەیەندراوە جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار رەوان کراوە، لەم بابەتەدا بە فەرمانی پاشا جەنابی ملوکانە چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم. | | |



DH.MKT.01347.00065.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01347.00065</td><td>22 رەمەزان 1302 (5 تەمموز 1885)</td></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>عەبدولرەحمان ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی هەکاری مردووە، لە شوێنی ئەو کەسێك دامەزراوە، بەڵام لە هەڵبژێردراوەکان نییە، بۆیە محەمەد زیا ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم و دەرچووی مەکتەبی مولکیەی شاهانە لە قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران ڕێکخراوە لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە بریار و فەرمان.</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>00992.078340</td><td>14 رەمەزان 1303 (16 حوزەیران 1886)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>فەرمی<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>محەمەد زیا بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە لەم ئەرکانەی کە پێی دراوە لێهاتوویی بینراوە، لەم بارەیەوە نووسراوی ویلایەتی هەکاری و نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، ناوبراو پلەی سێیەمی پێ بدرێت، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



DH.MKT.01351.00039.001

| 16 رەمەزان 1303 (18 حوزەیران 1886) | 01351.00039 | DH.MKT |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ

زانیاری کوشتنی سەلیم لەلایەن ئامۆزاکانیەوە بە ویلایەت راگەیەندراوە، لەلایەن ناوبراوانەوەش دژی قائیمقام سکالا بەرز کراوەتەوە، بەڵام دوای دەستگیرکردن و زیندانی کردنیان داوای جێبەجێ کردنی دادپەروەریان کردووە، بە واژووی خەڵکی عەمادیە ئیسماعیل و یاسین لە مەرکەزی موسڵ تەلەگرافنامە دەرچووە، وێنەیەکی پێشکەش کراوە و بە تێروانین لە بەرایيەکان ووردبینی بۆ بکرێت، بە لێکۆڵینەوەش روون دەبێتەوە، بە گوێرەی بارودۆخی راستەقینە کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت.




DH.TMIK.S.00004.00057.001

| DH.TMIK.S | 00004.00057 | 17 رەبیعی یەکەم 1304 (14 کانوونی یەکەم 1886) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بە گوێرەی ژمارەی مەسیحیەکانی قەزای دهۆك و زاخۆ و عەمادیە، پرسیار کراوە ئاخۆ پێویستە یاریدەدەر هەبێت و بەکار بێت یان نەبێت، لە ١٠ تشرینی دووەم ١٣٠٢ چاوەڕێی وەڵامی تەلەگراف دەکرێت.<br>زوهدی والی موسڵ | | |



İ.DH.01021

| İ.DH | 01021.080539 | 25 جەمادی یەکەم 1304 (19 شوبات 1887) |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>زیا بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی هەکاری بووردراوە و لە شوێن ئەو مستەفا روشدی ئەفەندی لە چینی دووەم و قائیمقامی پێشووی حارم دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە مەزبەتەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران و وەرەقەی پەسەندکراوی وەرگێردراوی کەسێتی و نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی ملوکانە بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم | | |




| İ.DH | 01041.081843 | 5 زیلقەعدە 1304 (26 تەمموز 1887) |
|---|---|---|

کۆشکی یلدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
راگەیەندراوی بەندەمانە
خاڵی سەربازی کارەکەی میری ئاڵای حەقی بەگ لە ئاڵای ١٥٧، دەکەوێتە رۆژئاوای تەرابلوس، پلەکەی بۆ میری لیوا بەرز بکرێتەوە و لە قوماندانیەتی لیوای ٥٢ی عەمادیەی فرقەی ٢٦ دامەزرێت، لەسەر ئاماژە و راگەیەندراوی سەر عەسکەر جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، ئاگاداری دراوەتە فەرمانگەی شکۆداری سەربازی، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
سورەیا سەرکاتیبی شەهریاری




DH.MKT.01373.00051.001

| 21 موحەررەم 1304 (20 تشرینی یەکەم 1886) | 01373.00051 | DH.MKT |
|---|---|---|

ویلایەتی هەکاری سەروو
محەمەد زیا بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە لەگەڵ کەشوهەوای عەمادیە ئاوێتە نەبووە و داوای کردووە بۆ قائیمقامیەتی قەزایەکی تر بگوازرێتەوە، داواکاریەکە حەواڵەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران کراوە، لە بارەی گۆرینەوەی فەرمانبەران دەبێ هەردوولا لاریان نەبێت لە گواستنەوەکە، کارەکەش لەسەر ویلایەت وەستاوە، جگە لەمە ناوبراو لە ناو ویلایەت لە قائیمقامی قەزایەك گۆرینەوەیان پێ دەکرێت، کە لە هەمان چین و یەکسان بن، بۆ کۆتایی هێنان بەم کارە بە نووسراوی قۆمیسیۆنی ناوهاتوو والا ئاگادار کراوەتەوە، بە گوێرەی رێنمایی هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.01396.00096.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01396.00096</td><td>7 جەمادی یەکەم 1304 (1 شوبات 1887)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی هەکاری سەروو<br>بۆ سەرژمێری نوێی قەزای عەمادیە ٢٠٠٠٠ ناسنامەی عوسمانی و دەفتەر و ئەوراقی گشتی ڕەوان کراوە، بۆ زانیاری و هەواڵی ناسنامەی ناوهاتوو لەگەڵ ڕووداوەکان دوو پارچە سەنەدی هاوبەش ڕێکخراوە و ڕەوان کراوە، لە وەڵامدا نووسراوی ٩ کانوونی یەکەم ١٣٠٢ ژمارە ٣٢ خوێندنەوەی بۆ کراوە، بە ناردنی هەشت یەکی ئەم ٢٠٠٠٠ ناسنامەیە، کارەکە جێبەجێ دەکرێت، دەفتەرداری ویلایەت و ئەمینی سندوق بە تۆمارەکە هەڵساون، نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، بە ڕاگەیاندنیشی نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>





DH.MKT.01399.00026.001

| DH.MKT | 01399.00026 | 17 جەمادی یەکەم 1304 (11 شوبات 1887) |
|---|---|---|
| جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>زیا بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە لە ئەرکەکەی بوردراوە، لە شوێن ئەو هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم مستەفا حوسێن ئەفەندی قائیمقامی پێشووی شێروان دامەزراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی نووسراو لە ویلایەتی هەکاری هاتووە و حەوالەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران کراوە، جگە لە گرنگی شوێنی جوگرافی قەزای ناوهاتوو، قەزاکە لە چینی دووەمە، بۆیە کارەکە ناکرێت، بەڵام مستەفا روشدی ئەفەندی قائیمقامی پێشووی حارم بە توانا و لێهاتوو و موسڵمانە و هەڵبژێردراوە لە چینی دووەم دابمەزرێت، لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو نووسراو بەرز کراوەتەوە، لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی پەسەند کراو بەیەکەوە پێشکەشی پەیوەندیداری سەدارەت بکرێت. | | |



DH.MKT.01403.00123.001

| DH.MKT | 01403.00123 | 14 جەمادی کۆتایی 1304 (10 مارت 1887) |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی هەکاری سەروو

ئەمین ئەفەندی کاتیبی تەحریراتی قەزای عەمادیە لە کارەکەی بووردراوە، لە مێژووی ١٠ تشرینی دووەمی ئەم ساڵەوە عەبدولقادر ئەفەندی بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەی داودیە دامەزرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی سەروو جێگیر کراوە، مانگانەش ٢٧٤ قوروش مووچەی بۆ دەبردرێتەوە، لە مێژووی ناوهاتووەوە ناوبراو مووچەی دیاریکراوی پێ دەدرێت و تۆماریش کراوە، بە گوێرەی بڕیارنامە مانگانە ئەم مووچەی وەریدەگرێت نیوەی دەدرێتە سندوقی خانەنشینی، کیتابەتی ناوهاتووش بە تۆمار لەسەر ناوی عەبدولقادر ئەفەندیە، لە بارەی مێژووی دامەزراندنی ئەمین ئەفەندی کاتیبی پێشوو، نووسراو بۆ والا کراوە، بە ووتەی ژمێریاری جێبەجێ بکرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1413 83

DH.MKT.01413.00083.001

| 24 رەجەب 1304 (18 نیسان 1887) | 01413.00083 | DH.MKT |
|---|---|---|
| ویلایەتی هەکاری سەروو<br>دانیشتوانی قەزای عەمادیە میزاجی وەحشی و خوی هۆزگەرییان هەیە، بۆیە لەم سەرژمێرە نوێیەی کراوە، سەرژمێرکردنی مێ جێگەی قەبوڵ کردن نەبووە، هەر خۆشی ویلایەتی موسڵ کە دراوسێیە، مێ لە دەرەوەی سەرژمێری بووە و ئەنجام نەدراوە، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی سەروو بە پەیوەندیداری سەدارەت راگەیەندراوە و هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی فەرمانی عالی. | | |




DH.MKT.01414.00085.001

| DH.MKT | 01414.00085 | 27 رەجەب 1304 (21 نیسان 1887) |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی هەکاری سەروو
بە مەبەستی تۆماری قەزای عەمادیە، تێچووی گواستنەوە و خەرجی سێ پاکێت ئەوراق رەوان کراوە، بۆ ئەم کارەش ئەوانس ئاغا لە قۆمیسیۆن داوای ۲۷۱ قوروش و نیوی کردووە، بەڵام کرێ و خەرجی ناوهاتوو ئاماژەی پێ نەکراوە، لە ویلایەتی سەروو نووسراوی ۲۷ تشرینی یەکەم ۱۳۰۲ رەوانی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، ئەم پاکێتانەی باس کراون ٧٤ پاکێتە و بە زانیاری قەپوکەتەودا و بە هاوکاری پۆستەخانە رەوان کراوە، رەوان کردنی کرێی دیکەش بە پێویست نەزانراوە، ئەمەش لە ژمێریاری ناوهاتوو بە پەراوێز واڵا ئاگادار کراوەتەوە.




DH.MKT.01418.00005.001

| 13 شەعبان 1304 (7 مایس 1887) | 01418.00005 | **DH.MKT** |
|---|---|---|
| جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>زیا بەگ قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە و دەرچووی مەکتەبی مولکیەی شاهانە لە قائیمقامیەتی قەزای شارکوی دادەمەزرێت، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە پێشکەشی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە، جێبەجێ کردنی لەسەر فەرمانی عالی وەستاوە. | | |




A.}MKT.UM.01744.00038.004

| A.MKT.UM | 01744.00038 | 13 موحەڕڕەم 1304 (12 تشرینی یەکەم 1886) |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی ناوەخۆ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>تەلەگرافنامە لە ویلایەتی هەکاری ڕەوان کراوە<br>لەسەر ئەم زانیاریيانەی لە ئەرکی خولاوە هاتووە، شوێنی جوگرافی ڕاگەیەندراوە، پشت بەستن بەم زانیارییە لە بارەی ڕێکخستنی عەمادیە وەکو سانجەق، دەستەکە بگوازرێتەوە عەمادیە، ئەم نووسراوانەی پێشکەش کراوە، بە پێویست زانراوە جێبەجێ کردنی دوابخرێت. | | |




Y.PRK.MYD.00007.00052.001

| Y.PRK.MYD | 00007.00052 | 6 زیلحیجه 1305 (14 ئۆغستۆس 1888) |
|---|---|---|

وێنەی تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ویلایەتی موسڵ هاتووە
دوێنێ ڕووداوەکانی نێوان تەیاریەکانی ویلایەتی وان و کوردەکانم ڕاگەیاند، لەم بارەیەوە ئەوەی لە فەرمانبەری لێکۆڵینەوە ڕەوان کراوە لەگەڵ ئەو زانیاریانەی لە گشت ناوچەکان وەردەگیرێت بە پەرشوبڵاوی رادەگەیەندرێت، خەڵکی ئەم دەورووبەرە جانەوەر و کەللە ڕەقن و کۆمەڵەکەیان گەورەیە، تا چاکسازی و ئاشت بوونەوەیان ئەنجام دەدرێت، ڕێگە نەدرێت ڕووبەرووی یەکتر ببنەوە و شەر ڕووبدات، هەروەها ڕێگە نەدرێت هاوکاری و پێداویستی بۆ هەردوولا بچێت، لە هەمان کاتدا لە ناوەراستی هەردوولادا هێزێکی سەربازی جێگیر بکرێت، ئەم هێزەش کە جێگیر دەکرێت بۆ شەڕ کردن نییە، تەنیا وەکو نمایشێك بێت، بەپەلە دوو تابوری پیادە و ٢٠٠ سوارەی سەربازی نیزامیە لەگەڵ قوماندانی لیوا لە نێوان قەزاکانی دهۆك و عەمادیە خێمە هەڵدەن و جێگیر بکرێن، لە فەرمانگەی ڕێنماییش بریار لەسەر جولەیان دەدرێت، بۆ جێبەجێ کردن فەرمانی پاشای پێویستە.
فائیق والی ویلایەتی موسڵ

تلغرافنامه

مخابرات تلغرافيه دن طولايى دولت هيچ بر مسئوليت قبول ايلمز

Y.PRK.MYD.00007.00121.001

| Y.PRK.MYD | 00007.00121 | 25 زیلحیجه 1305 (2 ئەیلوول 1888) |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی تاجداری دەرویش پاشا

مەسەلەی نێوان نەستوریەکان و کوردەکان بە تەواوەتی بخرێتە ژێر کۆنترۆڵ، بۆ ئەم مەبەستەش بە فەرمانی پاشا لە موسڵ، ٢ تابوور پیادەی سەربازی شاهانە لەگەڵ ٢ تۆپی چیا بە قوماندانیەتی میری لیوا حەقی پاشا بەرێدەکەون، بەڵام ڕێگاوبانی عەمادیە سەخت و هاتووچۆ دژوارە، هاوکاریش نەبووە بۆ سەربازانی سوارە، هەر خۆی لە سایەی ملوکانە بارودۆخەکە بە تەواوەتی هێور بۆتەوە، بۆیە ناردنی سەربازانی ناوبراو و بلۆکەکانی سوارە بە پێویست نەزانراوە، ڕاگەیەندراوە.
فائیق والی موسڵ



İ.DH.01083

<table>
<tr><th>İ.DH</th><th>01083.084973</th><th>16 رەمەزان 1305 (27 مایس 1888)</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>هەڵبژێردراو لە چینی دووەم ئەحمەد غالیب ئەفەندی قائیمقامی پێشووی سورمنە لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و پێشکەش کراوە، لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی و نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی ملوکانە بە فەرمانی پاشا فەرمانی چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




DH.MKT.01466.00060.001

| DH.MKT | 01466.00060 | 13 رەبیعی یەکەم 1305 (29 تشرینی دووەم 1887) |
| --- | --- | --- |
| لایەنی واڵای جەنابی سەر عەسکەر<br>بۆ راکێشانی نەفەری عەجەمی لەدایك بووی ١٢٨٣، لەسەر ئاماژەی سپپاهیدار ئەم دەفتەرانەی هاتووە لە قەزای عەمادیە رێك خراوە و رەوان کراوە، لە وەڵامدا نووسراوی ویلایەتی هەکاری هاتووە، دەفتەری ناوهاتووش بە هاوپێچەوە پێشکەشی سەر عەسکەر کراوە. | | |




DH.MKT.01470.00115.001

| DH.MKT | 01470.00115 | 6 رەبیعی کۆتایی 1305 (22 کانوونی یەکەم 1887) |
|---|---|---|
| ویلایەتی هەکاری سەروو<br>ماوەی یەك دوو ساڵە لە کاتی چوونە کوێستان و لە گەڕانەوەیان لە لایەن هرستیانەکان مەڕوماڵاتیان تالان دەکرێت، ئەمجارە ٣ نەفەریشیان کوژراوە، بۆ گەڕانەوەی سەرمەڕەکان بە واژووی دانیشتوانی قەزاکانی دهۆك و عەمادیە و بەیتولشەباب کە ناویان تۆمار کراوە لە مەرکەزی باستکە تەلەگرافنامە دەرچووە و وێنەیەکی هاوپێچ ڕەوان کراوە، بارودۆخەکە جێگەی تێروانین و ووردبینی و گرنگی پێدانە، دوای لێکۆڵینەوە بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت، ئەنجامەکەشی رابگەیەندرێت. | | |


DH.MKT.01478.00033.001

| DH.MKT | 01478.00033 | 4 جەمادی یەکەم 1305 (18 کانوونی دووەم 1888) |
|---|---|---|

جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
کوللە کشتوکاڵی دەورووبەری قەزای عەمادیەی لەناوبردووە، جگە لەمە هێشتا لە قەزای ناوهاتوو سندوقی شارەوانی و سودبەخش دانەمەزراوە و داهاتی شارەوانیش لە خەزینە وەردەگیری، چونکە سندوقی شارەوانی و سوودبەخش نییە، بە تەخمینی بۆ دانیشتوانی هەژاری ناحیەی ناوهاتوو و هەشت یەکی ساڵ لە پارەی داهاتی سوودبەخش رێك دەخرێت، نزیکەی ١٠٠٠٠ قیە گەنم بە کرین و فرۆشتن وەکو قەرەبووکردنەوە دابەش بکرێت، بە ئاماژەی ویلایەتی هەکاری جێبەجێ بکرێت و نووسراوی نەزارەتی دارایی شکۆدار رەوان کراوە، هاوپێچ رابگەیەندرێت و پێشکەش بکرێت، بە تێروانین لە بابەتەکە ئەم برە زەخیرەیە بە کرین بدرێتە دانیشتوانی ناوهاتوو، پەیوەندیداری سەدارەت هاوکار بێت.




DH.MKT.01496.00021.001

| DH.MKT | 01496.00021 | 9 رەجەب 1305 (22 مارت 1888) |
|---|---|---|
| ویلایەتی هەکاری سەروو<br>بەهۆی دەستدرێژی ئەندامانی ئەنجوومەن و دادگا و فەرمانبەران بۆ سەر دانیشتوانی قەزای عەمادیە، دانیشتوان ناچار دەبن هیجرەت بکەن، لەسەر هەندێك ووتە لە مەرکەزی باستکە تەلەگرافنامەی بە واژوو لەلایەن هەندێك کەسی ناسراو و تۆمار کراو هاوپێچ نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، هیممەت بکرێت. | | |




DH.MKT.01501.00039.001

| | | |
|---|---|---|
| **DH.MKT** | 01501.00039 | **5 شەعبان 1305 (17 نیسان 1888)** |
| لایەنی والای جەنابی سەرعەسکەر<br>قائیمقامی عەمادیە و ئەفسەری وەرگرتنی سەرباز ئەرکیان پێدراوە و پشت بەستن بە هەندێك ووتە لە ویلایەتی هەکاری تەلەگرافنامە لە مێژووی ٢١ شوبات ١٣٠٣ پێشکەشی بەندەمان کراوە، بۆ وەرگرتنی سەرباز لە عەمادیە و گوندەکانی دەورووبەر بە شێوەیەکی سەرکەوتوو کۆتایی پێ هاتووە، ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە وەرگیراوە، وێنەیەکی هاوپێچ پێشکەشی سوپاسالاری عالی کراوە. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1501 52

DH.MKT.01501.00052.001

| DH.MKT | 01501.00052 | 5 شەعبان 1305 (17 نیسان 1888) |
|---|---|---|
| ویلایەتی وانی عالی<br>مستەفا روشدی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە و هاوەڵانی زوڵم و دەستدرێژییان کردۆتە سەر هەندێك فەرمانبەران و دانیشتوانی هەژار، هەروەها قائیمقامی ناوهاتوو بە گشتی دادپەروەر نییە، لەسەر ئەم سکاڵایانەی هەیە، داواکاری لەلایەن دانیشتوانی قەزای ناوهاتوو بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و رابگەیەندرێت. | | |



DH.MKT.01508.00019.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01508.00019</td><td>2 رەمەزان 1305 (13 مایس 1888)</td></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>مستەفا عزەت ئەفەندی قائیمقامی قەزای راسولعەین لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە، لە موتەسەرفی روز ئاماژەی پێکراوە بەهۆی لێنەهاتووییەوە دوور خراوەتەوە و لە شوێن روشدی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە گوازراوەتەوە، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران هاتووە و هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی بە هاوکاری جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت دەبێت.</td></tr>
</table>



DH.MKT.01509.00004.001

| | | |
|---|---|---|
| 9 رەمەزان 1305 (20 مایس 1888) | 01509.00004 | **DH.MKT** |

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
بۆ قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە هەڵبژێردراو لە چینی دووەم ئەحمەد غالب ئەفەندی قائیمقامی پێشووی سورمنە دامەزرێت، نووسراو کراوە و لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران مەزبەتە دراوەتە قەڵەم، لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری پەیوەندیداری سەدارەتی پێویستە.


DH.MKT.01527.00106.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01527.00106</td><td>23 زیلقەعدە 1305 (1 ئۆغستۆس 1888)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وان/ تەلەگراف<br>لە ٢٩ حوزەیران ١٣٠٤ راگەیەندراوە، بۆ رێگەگرتن لە سەرپێچیەکانی تەیاری نەستوریەکان، لە تابورەکانی وان یا هەکاری دوو بلۆکی سەربازی شاهانە بگوازرێتەوە عەمادیە و نیشتەجێ بکرێت، لە موشیرەتی لەشکری چوارەم راگەیەندراوە، بە پەیوەندی لایەنی سەر عەسکەر وەڵام هاتووە، هەرچی زووە لە ویلایەت چارەسەر بکرێت و جێبەجێ بکرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.01537.00023.001

| DH.MKT | 01537.00023 | 20 سەفەر 1305 (7 تشرینی دووەم 1887) |
|---|---|---|

ویلایەتی وانی عالی

لەلایــەن بامەرنەلــی شــێخ محەمــەد ئەفەنــدی مەزرەعــەی سەرســەنگ ســەر بــە قــەزای عەمادیــە دەســتی بەســەر داگیــراوە، خاوەنەکــەی ســەردانی حکوومەتــی کــردووە، بــەڵام بــێ ئەنجــام بــوو، لەبــارەی رێگەگرتــن لــەم دەســتتێوەردانە، لەســەر هەندێــك ووتــە و بەزەیــی هاتنــەوە بــە واژووی عەبدولســەلام بریــکاری دانیشــتوان تەلەگرافنامــە هاتــووە بــە هاوپێــچ بــۆ ســەروو بــەرز کراوەتــەوە، بــە تێروانیــن لــە بابەتەکــە بــە لێکۆڵینــەوە روون دەبێتــەوە و راســتییەکان دەردەکــەون، بــە گوێــرەی بارودۆخەکــە جێبەجــێ بکرێــت و رابگەیەندرێــت.




عمادیه صندوغی امیننك یتمش آلتی بیك غروشه ذمت تعیه ایتدیکی حالده
محلی قائمقامی طرفندن صحابت ایدلدیکی ۲۱ کانون ثانی ۳۰۲ تاریخی ومخبر
یره امضاسی ایله باشکه مرکزنه چکیلان تلغرافنامه بیلدیرلمکله حقیقت
حالك اشعاری مطلوبدر



A.}MKT.UM.01779.00045.002

| A.MKT.UM | 01779.00045 | 21 جەمادی یەکەم 1305 (4 شوبات 1888) |
|---|---|---|
| ویلایەتی هەکاری<br>هەر کاتێك ٧٦٠٠٠ قوروش بخرێتە سەر زمەتی ئەمینی سندوقی عەمادیە، ئەوا لەلایەن قائیمقامی ناوەخۆ هاوەڵایەتی دەکرێت، لە ٢١ کانوونی دووەم ١٣٠٢ بە واژووی هەواڵگر تەلەگرافنامە لە مەرکەزی باستکە دەرچووە، هەرچی زووە راستییەکە ئاماژەی پێ بکرێت. | | |




تلغراف نامه

صدارت عظمايه



A.}MKT.UM.01793.00046.001

| | | |
|---|---|---|
| **14 زیلحیجە 1305 (22 ئۆغستۆس 1888)** | 01793.00046 | **A.MKT.UM** |

پەیوەندیداری سەدارەت

ماوەی ٢٠٠ ساڵە لە باوباپیرانەوە بەبێ کێشە و ناکۆکی مەزرەعەی سەرسەنگی قەزای عەمادیە لە ژێر دەسەڵات و بەڕێوەبردنی ئێمە دایە، بەڵام بەبێ هۆ لەلایەن شێخ محەمەد بامرنەلی دەستی بەسەر داگیراوە، داواکارم لەلایەنی سەروو کە فەرمانەکانی لە هەکاری بەبێ ئەنجام بووە و لە دادپەروەری بێ بەش بووین، پەنامان بۆ بەزەیی و میهرەبانی پاشا هێناوە، ڕێگە لە شێخ محەمەد بگیرێت و دادپەروەری جێبەجێ بکرێت.

عەبدولسەلام بریکاری دانیشتوان



ŞD.02159.00054.001

| 7 شەوال 1305 (17 حوزەیران 1888) | 02159.00054 | ŞD |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

داواکاری ٢٨ نیسان ١٣٠٤ ژمارە ٢٥ راگەیەندراوە، قەزای عەمادیە و ناحیەی سیندی وەکو جاران بەم ویلایەتە ببەسترێتەوە، هەروەها لە حەواڵە کردنی دە یەك بە تەلەگراف راگەیەندراوە، ئەگەرچی نووسراوی بە زانیاریش رەوان کراوە، بەڵام تا ئێستا بریارەکەی دەرنەچووە، بۆیە دەدرێتە خەزینەی شکۆدار، بە تێروانین لە سوود و ئەنجامەکەی پێش ئەوەی کات بە فیرۆ بروات بە تەلەگراف فەرمان بدرێت تکایە.

فائیق والی موسڵ



| ŞD | 02528.00022 | 30 ڕەبیعی یەکەم 1305 (16 کانوونی یەکەم 1887) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران
ژمارە ٥٠٦
بە هەژماری ساڵی ١٣٠٢ ی ناحیەی داودیەی سەر بە قەزای عەمادیە و لە کاتی ئەنجامدانی تیروپشك سەرپێچی ئەنجام دراوە، لەم کاتەشدا مستەفا حەسبی ئەفەندی بریکاری قائیمقامی قەزای ناوهاتوو و عەبدوڵڵا ئاغا بەڕێوەبەری ناحیەی ناوهاتوو دەستیان هەبووە، لەمانە مستەفا ئەفەندی بۆ بەتلیس و عەبدوڵڵا ئاغا بۆ دەرسەعادەت ڕۆیشتوون، لەم بابەتەدا وێنەی ئەوراقی لێکۆڵینەوەکان بەرز کراوەتەوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی نووسراو لە ویلایەتی هەکاری هاتووە، لەگەڵ هاوپێچەکان حەواڵەی قۆمیسیۆن کراوە، بە پێداچوونەوە و خوێندنەوەی ئەوراقی ناوهاتوو لەگەڵ ووردبینی کردنی مامەڵەی یاسایی پەیوەستە بە شورای دەوڵەت، پێشکەش کردن و گەڕاندنەوەی هاوپێچ ڕەوانی شورای ناوهاتوو کراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.
مۆری قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی مولکیە




Y.PRK.BŞK.00014.00015.010

| Y.PRK.BŞK | 00014.00015 | 13 موحەررەم 1306 (19 ئەیلوول 1888) |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>لـە نێـوان تائیفـەی کـورد و نەسـتوریەکان ساردیەکی تـەواو هەیـە، بـۆ بەرگـری کـردن لێـرەوە قوماندانـی سـەربازی شـاهانە میـری لیـوا حەقـی پاشـا لـە ٢٥ی ئۆغسـتۆس لـە موسـڵ جولـەی کـردووە و ٢ ی ئەیلـوول گەیشـتە عەمادیـە، بـۆ مەبەسـتی زانیـاری راگەیەنـدراوە، فەرمـان.<br>فائیق | | |




İ.DH.01134

| İ.DH | 01134.088565 | 29 شەعبان 1306 (30 نیسان 1889) |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>نووسراو کراوە مستەفا عزەت ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم و جیابووەوە لە قائیمقامیەتی قەزای رائسولعەین، لە قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی وان دابمەزرێت، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمانی جەنابی پاشا چی بێت جێبەجێ دەکرێت، نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم | | |





DH.MKT.01573.00074.001

| DH.MKT | 01573.00074 | 7 رەبیعی کۆتایی 1306 (11 کانوونی یەکەم 1888) |
|---|---|---|
| ویلایەتی وانی عالی<br>بە تەخمینی مۆری فەرمی تایبەتی هاتووچۆی ناسنامەی فەرمانبەرانی ناسنامە بە گوێرەی نیزامە، لە قەزای عەمادیە فەرمانبەرانی ناسنامە بوونیان هەیە، بۆیە مۆری هاتووچۆی ناسنامە بدرێتە قەزاکە، هەروەها تا ئێستا لە قەزای ناوهاتوو داوای مۆر نەکراوە و مۆر رەوانی ئەوێ نەکراوە، ئەمجارە بۆ فەرمانبەرانی ناسنامە مۆرێك دابین بکرێت، چۆنیەتی رەوان کردنیشی عالی ئاگادار کراوەتەوە، بە نووسراو لە کارگێری گشتی تۆماری ناسنامە ئاماژەی پێکراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |




DH.MKT.01578.00018.001

| DH.MKT | 01578.00018 | 20 رەبیعی کۆتایی 1306 (24 کانوونی یەکەم 1888) |
|---|---|---|
| جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>مستەفا سەفوەتی ئەفەندی قائیمقامی قەزای ئەسپەر لە کارەکەی بوردراوە، لە شوێن ناوبراو مستەفا حوسێن ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم دابمەزرێت، کە لە وەکالەتی قائیمقامی عەمادیە دوور خراوەتەوە، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و لەگەڵ هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندیدارانی وەکالەت. | | |



DH.MKT.01602.00038.001

| DH.MKT | 01602.00038 | 5 رەجەب 1306 (7 مارت 1889) |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی عالی

قەزاکانی عەمادیە و بەیتولشەباب و چاڵ سەر بە سانجەقی هەکارین، دانیشتوانی ئەم قەزایانە دژی یەکتر جولە دەکەن، بەردەوام رووداو روو دەدات، لەبەر ئەوەی هێلی تەلەگرافی نییە، لە کات و شوێنی خۆیدا هەواڵ و زانیاری ناگاتە شوێنی مەبەست و پەلە ناکرێت لە رەوان کردنی، بۆ هەر یەکە لەم قەزایانە و ئەم قەزایانەی ناویان تۆمار کراوە، هێڵێکی تەلەگراف درێژ بکرێتەوە و لە وەرزی بەهاریشدا دەست بە کار بکرێت، بۆ دروست کردنی هێلی ناوهاتوو هاوکاری رەوان بکرێت، لەم بارەیەوە لە ویلایەتی وانی عالی تەلەگرافنامە هاتووە و رەوانی عالی کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت.



DH.MKT.01602.00046.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01602.00046</td><td>5 ڕەجەب 1306 (7 مارت 1889)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی عالی<br>چەند ساڵێك دەبێت لە دەورووبەری قەزای عەمادیە کوللە سەری هەڵداوە، زەرەری بە کشتوکاڵ گەیاندووە، بۆیە لە رادەست کردنی تەکالیفی میری کێشە دروست بووە، لە ئەنجام ئەم ساڵە باجەکان زیادەی چۆتە سەروو، بەمەش مەغدورن و زوڵمیان لێ دەکرێت، لە زیادەکە ببووردرێن و لەسەر داواکاری گشت دانیشتوانی قەزای ناوهاتوو بە واژووی بریکارەکان تەلەگرافنامە بۆ سەروو رەوان کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە کارەکە جێبەجێ بکرێت، بە خوێندنەوەی عالی رابگەیەندرێت و هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>


DH.MKT.01623.00114.001

| 19 رەمەزان 1306 (19 مایس 1889) | 01623.00114 | DH.MKT |
|---|---|---|

لایەنی والای جەنابی سەر عەسکەر
بەهۆی گرنگی شوینی جوگرافی قەزای عەمادیە جێگیرکردنی ئاسایش و سەقامگیرکردنی ئەمنیەت پێویستە، بۆ ئەم مەبەستەش ٢ بلۆکی ئەم تابورانەی کە لە هەکاریدا هەیە، بەپەلە رەوانی قەزای ناوهاتوو بکەن، لەسەر هەندێك ووتەوە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی وانی سەروو دەرچووە و هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی راگەیەندراوە.



DH.MKT.01627.00101.003

| DH.MKT | 01627.00101 | 11 شەوال 1306 (10 حوزەیران 1889) |
|---|---|---|
| تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی وان<br>لە ١ مایس ١٣٠٥ مستەفا عزەت ئەفەندی لە قائیمقامیەتی عەمادیە دامەزراوە، ناوبراو لە زۆر قەزای گرنگ و بایەخدار خزمەتی هەبووە، هێشتاش نەگەیشتۆتە شوێنی مەبەست و دەست بە کار نەبووە، بۆیە دوورخستنەوەی لە ئەرکەکەی گونجاو نییە، لە کاتی ئەرکەکەی ئەگەر لە بابەتێك لێنەهاتوویی دەرکەوێت، ئەم کاتە ئاساییە سەیری بابەتەکە دەکرێت. | | |




DH.MKT.01630.00057.001

| DH.MKT | 01630.00057 | 22 شەوال 1306 (21 حوزەیران 1889) |
|---|---|---|

ویلایەتی وانی عالی
مستەفا عزت ئەفەندی قائیمقامی جیابووەوەی رائسولعەین لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە دامەزراوە، سەرەتا بە تەلەگرافنامە راگەیەندراوە، لە مێژووی دەست بە کار بوونی مانگانە ١٧٥٠ قوروش مووچەی بۆ دابین کراوە، لەگەڵ جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی مێژووی ناوهاتوو رادەگەیەندرێت و مانگانە ئەم مووچەی وەردەگرێت نیوەی بە بریارنامە رەوانی سندوقی خانەنشینی دەکرێت، خەرجی رێگاکەی ٢٢٧٨ قوروش لە ناوەخۆ رێکدەخرێت و لە خشتەی خەرجی تۆمار دەکرێت، بۆ ئەمەش بە عالی رادەگەیەندرێت و بە ووتەی ژمێریاری باسکراوە، جێبەجێ کردنی بۆ عالیە.






DH.MKT.01638.00060.001

| DH.MKT | 01638.00060 | 17 زیلقەعدە 1306 (15 تەمموز 1889) |
|---|---|---|

نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی عالی
لـە بـارەی درێژکردنـەوە و دروسـت کردنـی هێڵـی تەلەگرافـی قەزاکانـی بەیتولشـەباب و چـاڵ و عەمادیـەی سـەر بـە سـانجەقی هـەکاری لەگـەڵ ئـەم قەزایانـەی ناویـان تۆمـار کـراوە، تەلەگرافنامـە لـە ویلایـەت وانـی عالـی هاتـووە و لـە مێـژووی ٢٥ مایـس ١٣٠٥ بـۆ نەزارەتـی عالـی ڕەوان کـراوە، بـۆ دووپاتکردنـەوە ئەمجـارە تەلەگرافنامـە وەرگیـراوە و هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە و ئامـاژەی شـاهانە بەپەلـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و ڕابگەیەندرێـت.




DH.MKT.01648.00082.001

<table>
<tr><td>18 زیلحیجە 1306 (15 ئۆغستۆس 1889)</td><td>01648.00082</td><td>DH.MKT</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی عالی<br>لە بارەی درێژکردنەوە و دروست کردنی هێڵی تەلەگرافی قەزاکانی عەمادیە و بەیتولشەبابی سەر بە سانجەقی هەکاری لەگەڵ ئەم قەزایانەی ناویان تۆمار کراوە، لە یەکەم و دوا تەلەگرافانەی هاتوو لە ویلایەتی وان، بە مێژووی جیاواز نووسراوی بۆ کراوە، بۆ دووپاتکردنەوە ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە هاتووە لەگەڵ هاوپێچەکان بەیەکتر بەستراونەتەوە و بۆ عالی ڕەوان دەکرێن، بە تێڕوانین لە ئاماژەکانی پێشوو بە پەلە جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە ڕاگەیاندنی.</td></tr>
</table>



A.}MKT.UM.01795.00054.004

| | | |
|---|---|---|
| **A.MKT.UM** | 01795.00054 | **6 موحەررەم 1306 (12 ئەیلوول 1888)** |

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی
هۆبەی چوارەم
٣٣٣
راگەیەندراوی بەندەمانە
لە نێوان تائیفەی کورد و تەیارەکان ناکۆکی روویداوە، لەلایەن فەرمانبەرانی خۆجێی ئاشتەوایی نێوان ئەم لایەنانەیان راگەیاندووە، لە موشیرەتی لەشکری چوارەمی هومایۆنی شکۆدار تەلەگرافنامە هاتووە، وێنەی تەلەگرافنامەکە لە ١٨ ئۆغستۆس ١٣٠٤ بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت بەرز کراوەتەوە، لەم بابەتەدا بە پشت بەستن بە هەندێك ووتەی گرنگ و ئاماژەی پێشوو، ئەمجارە لە موشیرەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە هاتووە، وێنەی بەراییەکانی پێشکەشی سەروو دەکرێت، بە ووتەی فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی هاوپێچ پێشکەش دەکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
سەرعەسکەر




A.}MKT.UM.01797.00084.001

<table>
<tr><td>A.MKT.UM</td><td>01797.00084</td><td>10 سەفەر 1306 (16 تشرینی یەکەم 1888)</td></tr>
<tr><td colspan="3">تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی وان<br>سەربازی شاهانە بۆ قەزای عەمادیە رەوان کراوە، بە سوود وەرگرتن لە هاوکاری ئەمانە و پارێزگاری کردنیان، لە شوێنی ناوهاتوو کێشە دروست بووە، بۆیە بە تەواوەتی ناوچەی گارە رەت بکرێتەوە، لە نەزارەتی دارایی ئاماژەی پێکراوە، داواکراوە ئەم بابەتە لە خۆجێی خوێندنەوەی بۆ بکرێت و ئاماژەی پێ بکرێت.</td></tr>
</table>




A.}MKT.UM.01797.00094.001

| 10 سەفەر 1306 (16 تشرینی یەکەم 1888) | 01797.00094 | **A.MKT.UM** |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
ژووری تەلەگراف
ویلایەتی وان
لەم ماوەیەدا سەربازی شاهانە روویان لە عەمادیە کردووە، لە هاوکاری کردنیان سوود بینراوە، لەم بارەیەوە خوێندنەوەی بۆ کراوە و داواکراوە ئاماژە بدرێتە ناوەخۆ.




تلغراف نامه

مخابرات تلغرافيه دن طولايي دولتجه هيچ بر گونه مسئوليت قبول اولنمز

مقام جليل صدارت پناهي یه

عماديه ده ولايتك حكاري سنجاغي داخلنده اولديغنه دائر تلغرافنامه سامي فخيمانه لري ولايت مشار اليهايه تبليغ ايله

موصل والیسی
رشید



A.}MKT.UM.01809.00093.001

| 19 ڕەجەب 1306 (21 مارت 1889) | 01809.00093 | **A.MKT.UM** |
|---|---|---|
| پایەی شکۆداری پەیوەندیداری خەلافەت<br>لە ٨ مارت ١٣٠٥ عەمادیە دەکەوێتە ناو سانجەقی هەکاری سەر بە ویلایەتی وان، بە تەلەگرافنامە ویلایەتی ناوهاتوو ئاگادار کراوەتەوە، فەرمان.<br>ڕەشید والی موسڵ | | |




تلغراف نامه



A.}MKT.UM.01810.00022.001

| A.MKT.UM | 01810.00022 | 22 رەجەب 1306 (24 مارت 1889) |
|---|---|---|

جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت

لـە ویلایەتـی موسـڵ ئـاگادار کراوەتـەوە، وەڵامـی تەلەگرافنامـەی ٨ مـارت ١٣٠٥ پەیوەندیـداری وەکالەتـە، قـەزای عەمادیـە سـەر بـە سـانجەقی هەکاریـە، لەسـەر ئـەم تەلەگرافنامەیـەی کـە دانیشـتوان بـۆ بەندەمـان رەوانیـان کـردووە، چۆنیەتـی کارەکـە لـە موتەسـەرفی ناوهاتـوو پـرس کـراوە، ئەمجـارە بـۆ دووپاتکردنـەوە پـرس کراوەتـەوە، ئـەم زانیارییـە راسـتییەی وەردەگیرێـت  رادەگەیەندرێـت.

خەلیل والی وان




A.}MKT.UM.01815.00084.001

| A.MKT.UM | 01815.00084 | 30 رەمەزان 1306 (30 مایس 1889) |
|---|---|---|

جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت

لە ویلایەتی موسڵەوە وەڵامی پەیوەندیداری وەکالەتی ٩ مارت ١٣٠٥، لە قەزای عەمادیە ماوەی ٢-٣ ساڵ دەبێت کوللە هەیە، هەر چەندە زیانی نەبووە، کەچی ووشکە ساڵی و گرانی هاتووە، بەڵام مردن و گواستنەوەی خانە نەبووە، ئەگەرچی گۆرانکاریەکی ئەوەتۆ رووی نەداوە، هەندێکیان تووشی مەغروری بوونە، مەبەستیانە سەر لە نوێ باج و شوێنگرەوەی سەربازی نەدەن، لە موتەسەرفی هەکاری ئاماژەی پێکراوە، بۆ گۆرانکاری پێویستە دادپەروەری جێبەجێ بکرێت، بە موتەسەرفی ناوهاتوو راگەیەندراوە، راگەیەندراوە فەرمان.

خەلیل والی وان




DH.MEM.00002.00106.001

| DH.MEM | 00002.00106 | 15 سەفەر 1307 (11 تشرینی یەکەم 1889) |
| --- | --- | --- |
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە ٢ ئەیلوول ١٣٠٥، ماوەیەکی درێژە قەزای عەمادیە بە وەکالەت بەڕێوەدەبردرێت، ئەمەش هیچ گونجان و بەرژەوندێکی تێدا نییە، سەعید ئەفەندی کە لە قائیمقامیەتەکەی دادەمەزرێت، هێشتا بریار لە عالی دەرنەچووە، بەڵام بەپەلە ڕەوان بکرێت، ڕاگەیەندراوە فەرمان.<br>خەلیل والی ویلایەتی وان | | |

تلغراف نامه

مخابرات تلغرافیه‌دن طولایی دولت هیچ بر مسئولیت قبول ایتمز

Y.PRK.AZJ 16/84

Y.PRK.AZJ.00016.00084.001

| 4 شەوال 1307 (24 مايس 1890) | 00016.00084 | Y.PRK.AZJ |
|---|---|---|
| لە موشیرەتەکانی پایەبەرزی عالی بۆ دەرویش پاشا<br>مەعروف ئەفەندی ئاغای قولی تابوری دووەمی ئالای ٤١ی لەشکری شەشەمی هومایۆنی نیزامیە ئەرکی پاراستنی ئاسایشی عەمادیەی پێدراوە، دڵسۆزی و ڕێزی و ملکەچی ئەفەندیمان بۆ شاهانە جێگەی شایەدیە، بۆیە تکا دەکەم پلەکەی بەرز بکرێتەوە، فەرمان.<br>داواکار محەمەد خالد | | |




Y.MTV.00043.00014.001

<table>
<tr><td>5 شەعبان 1307 (27 مارت 1890)</td><td>00043.00014</td><td>Y.MTV</td></tr>
<tr><td colspan="3">حەواڵـەی لایەنـی بەندەمـان کـراوە، جێبەجـێ کردنـی بـە بریـار و فەرمانـی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت دەبێـت، لەلایـەن پاشـای بەنـدە بـاش کاتیـب نـووسراوی پاشـای سـەر عەسـکەر ڕەوان کـراوە، لـە مەزبەتـەی فەرمانگـەی ئەرکانـی جەنگـی گشـتی ڕاگەیەنـدراوە، ئەگەرچـی بـۆ سـەقامگیرکردنی ئاسایشـی عەمادیـە، ٦ بلۆکـی سـەربازی شـاهانەی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن، لەلایەنـی موسـڵ ڕەوان دەکرێـت، بـەڵام لـە بابەتـی قومانـدان و کارگێـری بەیەکجـاری داوای زانیـاری لـە ئەدهـەم پاشـا قوماندانـی کەرکـووك کـراوە، بریـار و فەرمانـی شاهەنشـا چـی بێـت جێبەجـێ دەکرێـت، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە بریـاری بـە دەسـتەوەیە.<br><br>بەندە دەرویش</td></tr>
</table>




Y.A.RES.00050.00029.001

| Y.A.RES | 00050.00029 | 29 جەمادی کۆتایی 1307 (20 شوبات 1890) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بۆ ئەوەی جارێکی تر دوژمنایەتی نێوان تەیاریەکانی دانیشتوی قەزای عەمادیە و بەرواریەکان دووبارە نەبێتەوە، ئامادەکاری پێویست ئەنجام بدرێت، لەسەر داواکاری جەنابی پاشا بۆ جەنابی دەرویش پاشا رەوان کراوە، فەرمانی پاشا رەوان کراوە و نووسراوی تایبەتی ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان خوێندنەوەی بۆ کراوە، لە خوێندنەوەکە مەزبەتە رێکخراوە و بە هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە بارەی بەراییەکان جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم




DH.ŞFR.00143.00097.001

| DH.ŞFR | 00143.00097 | 19 شەوال 1307 (8 حوزەیران 1890) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بـە مەبەسـتی گەشـت کـردن باڵیـۆزی ئینگلیـز لـە وان، لـە زۆربـەی قەزاکانـی سـانجەقی هـەکاری گـەراوە و لـە قـەزای عەمادیـە چۆتـە قـەزای زاخـۆ لـە ویلایەتـی موسـڵ، دیسـان لـە ڕێگـەی حەلـەب بـە نیـازە بگەڕێتـەوە، ئامـۆژگاری و ڕێنمایـی نهێنـی دراوەتـە موتەسـەرف و قائیمقامەکانـی هـەکاری، هەروەهـا زانیـاری دراوەتـە ویلایەتـی ناوهاتـووش، ڕاگەیەنـدراوە فەرمـان.<br>خەلیل والی وان | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
500 | 67 | 2

A.}MKT.MHM.00500.00067.002

| A.MKT.MHM | 00500.00067 | 22 رەمەزان 1307 (12 مایس 1890) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە بارەی درێژکردنەوەی هێڵەکانی تەلەگرافی قەزای عەمادیە و دەورووبەری بە فەرمانی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت، نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی ئاگادار کراوەتەوە، لە نووسراوی مێژووی ١٧ شوبات ١٣٠٥ ژمارە ١١ ی پەیوەندیداری نەزارەت بریار و نووسراوی بۆ کراوە، بەڵام ئەمڕۆ نە فەرمانبەران و نە حکوومەت ئاگادار نەکراوەتەوە، بۆ رۆژێکیش بێت دەستپێشخەری نەبووە، بۆ ئەم هێڵە ناوهاتووە بەپەلە دروست بکرێت و کاتەکە گونجاوە بۆ کارەکە، بە تەلەگراف لایەنی بەندەمان و فەرمانبەران ئاگادار کراوەتەوە، نەزارەتی ناوهاتوو دەست بە کارەکە بکات، بە گرنگیەوە راگەیەندراوە.
خەلیل والی وان



| İ.DH | 01151.090011 | 9 موحەررەم 1307 (5 ئەيلوول 1889) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
قائیمقامی قەزای عەمادیە بە کراوەیی ماوەتەوە، هەڵبژێردراو لە چینی دووەم سەید ئەفەندی جیابووەوە لە قائیمقامیەتی ئوخرە دابمەزرێت، مەزبەتەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران و وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا فەرمانی پاشای جەنابی شەهریار چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم


İ.DH 1186/92812

İ.DH.01186

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01186.092812</td><td>2 زیلحیجە 1307 (20 تەمموز 1890)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە جێگیرکردن و سەقامگیری قەزا تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی قەزای عادولجەواز سەر بە ویلایەتی وان لێهاتوو نییە، لە بارەی کاروباری عەشیرەتەکانەوەش بۆ ئەوەی بە پێچەوانەی یاسا رەفتار نەکات و رێگە نەدرێت کاری سەرپێچی بکات، دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو سەید ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە بگوازرێتەوە، لە شوێن ئەویش عومەر لوتفی بەگ هەڵبژێردراو لە چینی یەکەم و بوردراو لە قائیمقامی حەجەریە دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی و نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا فەرمانی پاشای جەنابی پاشا چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



DH.MKT.01652.00058.001

| DH.MKT | 01652.00058 | 2 موحەررەم 1307 (29 ئۆغستۆس 1889) |
| --- | --- | --- |
| جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>مستەفا عززەت ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی وان مردووە، سەید ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی دووەم و دابراو لە قائیمقامیەت دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کراوە، مەزبەتەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران ڕێکخراوە و هاوپێچ لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی ناوبراو ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری سەرووی دەوێ. | | |




DH.MKT.01656.00067.001

| DH.MKT | 01656.00067 | 16 موحەررەم 1307 (12 ئەیلوول 1889) |
|---|---|---|
| تەلەگراف بۆ ویلایەتی وان<br>بە فەرمانی پاشا لە مێژووی ١١ موحەررەم ١٣٠٧ سەید ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە دامەزراوە. | | |




DH.MKT.01656.00108.001

| DH.MKT | 01656.00108 | 18 موحەڕرەم 1307 (14 ئەیلوول 1889) |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی تەلەگرافی عالی
شارۆچکەی عەمادیە کراوەتە مەرکەزی پاراستن خانە، لە بابەتی گرنگیشدا لە کات و شوێنی خۆیدا زانیاری وەربگیرێت، جگە لەمە شارۆچکەی چۆڵەمێرگ کە بۆتە مەرکەزی سانجەقی هەکاری، داهاتی شارۆچکەی ناوهاتوو لەگەڵ قەزای بەرجیس تا ویلایەتی بەتلیس بۆ هەر یەکە هێڵێکی تەلەگراف درێژ بکرێتەوە، بە ئاماژەی ویلایەتی وان لە نەزارەتی تەندروستی شکۆدار بە گرنگیەوە ئاماژەی پێکراوە، بەهۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی کۆلێرا لە ناوچە پێویستەکان هێڵی تەلەگراف درێژ بکرێتەوە، بە فەرمانی جەنابی پاشا ڕەزامەندی نیشان دراوە، بە تێروانین لە ئاماژەی پێشووی ویلایەتی وان بەپەلە جێبەجێ بکرێت.




DH.MKT.01662.00025.001

| DH.MKT | 01662.00025 | 5 سەفەر 1307 (1 تشرینی یەکەم 1889) |
|---|---|---|

ویلایەتی وانی عالی

بە تەلەگراف ئاماژەی پێکراوە سەید ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە دامەزراوە، لە مێژووی دەست بە کار بوونیەوە بە تۆمار مانگانە ٢٥٠٠ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، خەرجی رێگاکەشی ٣٣٥٠ قوروشە، بە رێنمایی لە دارایی خۆجێی دابین دەکرێت، بە سەنەد لە خشتەی خەرجی تۆمار کراوە، پشت بەستن بە بریارنامەش مانگانە ئەم مووچەی وەریدەگرێت نیوەی دەستی بەسەر دادەگیرێت بۆ سندوقی خانەنشینی دەنێردرێت، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو بۆ عالی کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



DH.MKT.01668.00149.001

| DH.MKT | 01668.00149 | 27 سەفەر 1307 (23 تشرینی یەکەم 1889) |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی شکۆدار
مستەفا عـزەت ئەفەنـدی قائیمقامـی پێشـووی قـەزای عەمادیـە مـردووە، لەلایـەن خێزانەکـەی داواکاری بـەرز کراوەتـەوە و داوای مووچـە دەکات، لەسـەر ئـەم داواکاریـە لـە قەڵەمـی فەرمانبـەران لێکۆڵینـەوەی پێویسـت ئەنجام بدرێـت، خشـتەی مـاوەی خزمەتی ناوبراوی مردوو ڕێکخراوە و بە نـووسراو دوو پارچە وەرەقەی لێکۆڵینەوەی قەڵەمی ناوهاتـوو ڕەوان کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە و پشـت بەسـتن بـە بڕیارنامـەی تایبەتـی یاسـا جێبەجـێ بکرێـت.




DH.MKT.01677.00150.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01677.00150</td><td>6 ڕەبیعی کۆتایی 1307 (30 تشرینی دووەم 1889)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی عالی<br>سلێمان ئەفەندی لە کیتابەتی تۆماری قەزای عەمادیە دامەزراوە، بە دەست بە کاربوونی لە مێژووی ٢٠ نیسان ١٣٠٥ و بە ئاماژەی نووسراوی عالی مێژووی ١٢ تشرینی یەکەم ١٣٠٥ ژمارە ٧١ ئەرکەکەی پەسەند کراوە، بە گوێرەی تۆمار مانگانە ٢٧٤ قوروش مووچە دابین کراوە و ڕێکخراوە، پشت بەستن بە بڕیارنامە جێبەجێ دەکرێت و ئەم مانگانەی کە وەریدەگرێت نیوەی مووچەکەی دەدرێتە سندوقی خانەنشینی، بە عالی ڕاگەیاندراوە و لە نەزارەتی ژمێریاری حەواڵە کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



DH.MKT.01728.00057.001

| | | |
|---|---|---|
| 13 شەوال 1307 (2 حوزەیران 1890) | 01728.00057 | DH.MKT |

ویلایەتی وانی عالی

لەبەر کێشەی جەستەیی، بە مۆڵەت دەستی لە کار کێشاوەتەوە و بۆ گۆرینی کەشوهەوا دەرچووە، کەسێکی تریش لە شوێنی دانراوە، جگە لەمە مووچەکەی بۆ شوێنی مانەوەی گوازراوەتەوە، لەبەر هەژاری و دەستکورتی لە مووچەی کۆکراوە مانگانەکەی پێ بدرێت، هەروەها داوای کردووە بگەرێندرێتەوە سەر کارەکەی، لەلایەن سلێمان ئەفەندی کاتیبی تۆماری پێشووی قەزای عەمادیە داواکاری بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.01728.00104.001

| DH.MKT | 01728.00104 | 15 شەوال 1307 (4 حوزەیران 1890) |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە و ویلایەتی وانی عالی
لەبەر ئەوەی شارۆچکەی عەمادیە بۆتە مەرکەزی پاراستن، لە کات و شوێنی خۆیدا زانیاری بابەتە گرنگەکان وەربگیرێت، هەروەها شارۆچکەی چۆلەمێرگ مەرکەزی سانجەقی هەکاری تا شارۆچکەی عەمادیە لەگەڵ شارۆچکەی بەرجیس هێڵی تەلەگراف درێژ بکرێتەوە، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی وان لە نەزارەتی تەندروستی شکۆدار راگەیەندراوە، بەهۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی کۆلێرا لە ناوچەکانی پێویست درێژ کردنەوەی هێلی تەلەگراف جێبەجێ بکرێت، لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بابەتەکە بە نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی عالی گفتوگۆ کراوە، مەزبەتە لە شورای دەوڵەتی فەرمانگەی ناوەخۆ رێکخراوە و حەواڵەی قەڵەم کراوە، وێنەیەکیشی دراوەتە عالی، لەبەر ئەوەی ناوچەکان لە رووی بازرگانیەوە گرنگ نین، بۆیە نەخۆشی کۆلێرا بەسەرچووە و کۆتایی پێ هاتووە و درێژکردنەوەی هێلی تەلەگراف بە پێویست نەزانراوە، بە نەزارەتی ناوهاتوو راگەیەندراوە و هەروەها زانیاری بدرێتە ویلایەتی عالی ناوهاتوو، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە.




DH.MKT.01738.00069.001

| DH.MKT | 01738.00069 | 14 زیلقەعدە 1307 (2 تەمموز 1890) |
|---|---|---|
| نەزارەتی تەندروستی شکۆدار<br>بابەتەکە لە عالی ئامازەی پێکراوە و چۆنیەتی کارەکەش لە ویلایەتی ناوهاتوو بۆ پایەی بەندەمان بەرز کراوەتەوە، لە بارەی ئەم نەخۆشیەوە زانیاری دراوە، لە نووسراوی دەوڵەت پزیشك داواکراوە، لەگەڵ خۆجێی قسە کراوە.<br><br>لە بارەی ئەم نەخۆشیەی کە لە قەزای عەمادیە سەری هەڵداوە. | | |




DH.MKT.01739.00114.001

| DH.MKT | 01739.00114 | 20 زیلقەعدە 1307 (8 تەمموز 1890) |
|---|---|---|

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی قەزای عادولجەواز لە پاراستنی ئاسایشی قەزا و جێگیرکردنی لێهاتوو نییە، لە کاری دەیەك و گشت کارە تایبەتەکاندا پێچەوانەی یاسا کاری کردووە، بۆ ئەوەی رێگە نەدرێت ئەم سەرپێچیانە درێژە بکێشێت، لە ویلایەتی وانی عالی ئاماژەی پێکراوە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو سەید ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە، لە شوێن ئەویش عومەر لوتفی بەگ قائیمقامی جیابووەوەی حەجەریە و هەڵبژێردراو لە چینی یەکەم دامەزرێت، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، هاوکاری جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتی پێویستە.




DH.MKT.01740.00081.001

| DH.MKT | 01740.00081 | 21 زیلقەعدە 1307 (9 تەمموز 1890) |
|---|---|---|

نەزارەتی پزیشکی سەروو
نەخۆشـی لـە قەزاکانـی عەمادیـە و جاڵـی سـەر بـە سـانجەقی هـەکاری سـەری هەڵـداوە، بـۆ ناردنـی پزیشـکێك لـە ویلایەتـی وان نـووسراو کـراوە، سـەرەتا ئـەم پزیشـکەی کـە داواکـراوە پرسـیار کـراوە، ئاخـۆ لـە فەرمانگەی شـارەوانی لیـوا دەتوانرێـت بـری چەنـد مووچـەی بـۆ دابیـن بکرێـت؟، ئەمجـارە لـە لیـوای ناوهاتـوو تەلەگرافنامـە هاتـووە و رایگەیانـدووە داهاتـی شـارەوانی ناوهاتـوو توانـای دابیـن کردنـی مووچـەی نییـە، بـەڵام نیشـان دراوە لـە هـەر سـێ شـارەوانی ئـەم قەزایانـەی ناویـان تۆمـار کـراوە، دەتوانرێـت مانگانـە ٥٠٠ قـوروش دابیـن بکرێـت، بـە تێروانیـن لـەم حاڵەتـە بـەم بـرە مووچەیـە پزیشـکێك بدۆزرێتـەوە و بەپەلـە دابمەزرێـت و هیممـەت بکرێـت لـە ڕەوان کردنـی.



DH.MKT.01747.00044.001

| DH.MKT | 01747.00044 | 16 زیلحیجە 1307 (3 ئۆغستۆس 1890) |
|---|---|---|
| لە قائیمقامیەتی زێبار ئاگاداری دەرچووە و تێدا روون بۆتەوە، نەخۆشی بڵاوبۆتەوە، لە چواردەوری ناوچەکە نەخۆشیەکە لە شارۆچکەی عەمادیە بڵاوبۆتەوە، کار بۆ ئامادەکاری پاراستن بکرێت، لە ویلایەتی وان ئاماژەی پێکراوە، لە ویلایەتی موسڵ بە تەلەگراف ئاگاداری دراوەتە ویلایەتی وان. | | |




DH.MKT.01749.00122.001

| 25 زیلحیجە 1307 (12 ئۆغستۆس 1890) | 01749.00122 | **DH.MKT** |
|---|---|---|

جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
هەوڵ و کۆششەکانی عومەر لوتفی ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی وان بینراوە، بەهۆی کارە باشەکانیەوە پلەی سێیەمی پێ بدرێت، بۆ ئەمەش ڕەزامەندی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتی پێویستە.




Y.PRK.ASK.00066.00033.001

| Y.PRK.ASK | 00066.00033 | 18 ڕەبیعی یەکەم 1308 (1 تشرینی دووەم 1890) |
|---|---|---|

پایەی سەرعەسکەر
قەڵەمی مەکتوب
تایبەتی
لـە تەیاریـەکان سـفکو کـوڕی موختـار بـە تاقمێـك حەشـەرات هێرشـیان کردۆتـە سـەر گونـدی مسراویـش، ٣ کاتژمێـر لـە عەمادیـە دووره، هەروەهـا بـە مەبەسـتی کوشـتنی موختـار دانیشـتوانی بەروارییـان هـان داوە و دەوروبـەری خانـەی ناوبراویـان ئابڵوقـە داوە، هەوڵـی ڕزگارکردنـی ئابڵوقـەدراوەکان دراوە، لـە تەیاریـەکان فرقەیەکـی تـر لەسـەر هاتنـن و قائیمقامـی قـەزاش لەگەڵیانـە، لـە تابورەکانیـش مەفرەزەیەکـی ١٦٠ کەسـی لەگـەڵ خۆیـان هێنـاوە و جولەیـان کـردووە و ئەنجامەکەشـی رادەگەیەندرێـت، بـە ئامـاژەی قائیمقـام عەزیـز بـەگ، لـە قوماندانیەتـی فرقـەی ١٢ راگەیەنـدراوە، لـە موشـیرەتی لەشـکری شەشـەم تەلەگرافنامـە هاتـووە و ئامـاژەی پێکـراوە، لەسـەر قسـەی عالـی نـووسراو بـۆ راگەیاندنـی زانیـاری کـراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمانـی بەدەسـتەوەیە.
عەلی رزا سەر عەسکەر


٥٩٦

İ·DH 1191/93205

2

İ.DH.01191

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01191.093205</td><td>14 موحەررەم 1308 (30 ئۆغستۆس 1890)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی ناوەخۆ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>٥٩٦<br>جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>بەهۆی خزمەتە باشەکانی عومەر لوتفی بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی وان، لە پلەی سێیەم بۆ دووەم پلەکەی بەرز بکرێتەوە و پاداشت بکرێت، جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت هاوکار بێت و لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>



DH.MKT.01760.00078.001

| DH.MKT | 01760.00078 | 28 موحەررەم 1308 (13 ئەیلوول 1890) |
|---|---|---|
| جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>بە فەرمانی پاشا خەرجی نۆژەنکردنەوەی هێڵی تەلەگرافی قەزای عەمادیە و دەوروبەری سەر بە ویلایەتی وان لە بودجەی ئەم ساڵەدا شوێنگرەوەی نەبووە، لە کاتی گفتوگۆ لە نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی راگەیەندراوە، چۆنیەتی کارەکە لە مێژووی ٢٣ حوزەیران ١٣٠٦ بە هاوپێچ وەڵام دراوەتەوە و نووسراوی بۆ کراوە، ئەمجارە لەسەر رەوان کردنی تەلەگرافنامە لە ویلایەتی ناوهاتوو گفتوگۆ لەگەڵ نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، نووسراوی بەندەی ناوهاتوو لەگەڵ تەلەگرافنامە بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە پەراوێزی نووسراوەکە وەڵامی بابەتەکە دراوەتەوە و پاڵپشتی بابەتەکەی کردووە، بە هاوکاری جەنابی پەیوەندیداری وەکالەتی شکۆدار بریار و فەرمان دەربچێت، تا کارەکە جێبەجێ بکرێت. | | |




DH.MKT.01762.00041.001

| 3 سەفەر 1308 (18 ئەیلوول 1890) | 01762.00041 | **DH.MKT** |
|---|---|---|
| ویلایەتەکانی وان و ئەنقەرە<br>محەمەد ئەمین ئەفەندی قائیمقامی قەزای بوغازلیان پلەی سێیەم و عومەر بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە پلەی دووەمی پێ دەدرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە لایەنی پەیوەندیداری سەدارەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی جەنابی پاشا دەرچووە و لە هومایۆن جێبەجێ دەکرێت. | | |



DH.MKT.01771.00068.001

| DH.MKT | 01771.00068 | 1 رەبیعی یەکەم 1308 (15 تشرینی یەکەم 1890) |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی وانی عالی

سلێمان ئەفەندی کاتیبی تۆماری قەزای عەمادیە ئەرکەکەی بۆ قەزای گەوار گواستۆتەوە، لە شوێن ئەو حەسەن ئەفەندی کاتیبی تۆماری پێشووی قەزای مکس دەمەزراوە و پەسەند کردنی ئەرکەکەی لەسەر ئاماژەی عالی جێگیر کراوە، هەروەها ناوبراو لە مێژووی دەست بە کار بوونی بە گوێرەی تۆمار مانگانە ٢٧٤ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، دابین کردنی تۆمار کراوە و لە شوێن خۆیدا جێبەجێ دەکرێت، بە پشت بەستن بە راگەیاندنی مێژووی ناوهاتوو و بریارنامە، مانگانە ئەم مووچەی وەریدەگرێت نیوەی بۆ سندوقی خانەنشینی دەروات، بە عالی راگەیەندراوە و بە ووتەی نەزارەتی ژمێریاری ئاماژەی پێکراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.01799.00007.001

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>01799.00007</th><th>1 جەمادی کۆتایی 1308 (12 کانوونی دووەم 1891)</th></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی عالی<br>بەهۆی مردنی حوسێن ئەفەندی فەرمانبەری ناسنامەی قەزای عەمادیە، ساڵح ئەفەندی ئەنتاڵیەیی لە شوێن ناوبراو دادەمەزرێت، لەسەر ئاماژەی نووسراوی ١٤ مارت ١٣٠٦ی عالی جێگیر کراوە و حەسەن ئەفەندی لە ئەرکی فەرمانبەری ناسنامەی قەزای ناوهاتوو بووە، حەسەن ئەفەندی مردوو و کاتیبی داهاتوو ساڵح ئەفەندی لە مێژووی دەست بە کار بوونیان بە گوێرەی تۆمار مانگانە ٢٥٠ قوروش مووچەی بۆ دابین کراوە، راگەیاندنی مێژووی دەست بە کار بوونیان و لە بارەی سندوقی خانەنشین و پشت بەستن بە کۆڵەکەی بریارنامە مامەڵەکە جێبەجێ دەکرێت، بریار و کەفالەتی ساڵح ئەفەندی بە وەرگرتنی سەنەد دەبێت، پاراستنی لە ویلایەتیش بە عالی راگەیەندراوە، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>


DH.MKT.01815.00081.001

| 24 رەجەب 1308 (5 مارت 1891) | 01815.00081 | DH.MKT |
|---|---|---|
| ویلایەتی وانی عالی<br>بەهای پارە بە شێوەیەکی ستاندار دەستاودەست ناکات، بۆیە تووشی زەرەر بوونەتەوە، بۆ ئەوەی پارەکان بە نرخی فەرمی میری لە نێوان دانیشتوان دەستاودەست بکات، لە سندوقی دارایی بە شێوەی یەکسان قەبوڵ بکرێت، لەسەر هەندێك ووتە و داواکاری بە واژووی بریکارەکانی قەزای عەمادیە تەلەگرافنامە هاتووە، لەم بارەیەوە بە ئاماژەی زانیارییەکان و خوێندنەوەی عالی هیممەت بکرێت. | | |




DH.MKT.01818.00009.001

| | | |
|---|---|---|
| 30 ڕەجەب 1308 (11 مارت 1891) | 01818.00009 | DH.MKT |

لایەنی والآی جەنابی سەرعەسکەر

ئەندامانی زەبتیەی قەزاکانی بەیتولشەباب و چالی و عەمادیە تفەنگی وینجەستەر رادەست بکەن و لە کۆگا هەڵبگیرێت، بە وەرگرتنی قەرزی نیزامیە لە ویلایەتی موسڵ بۆ ئەندامانی ناوهاتوو تفەنگی ڕەمینگتۆن و شنایدەریان بۆ بکردرێت و پێیان بدرێت، نووسراو لە ویلایەتی وان ڕەوان کراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەکە بەپەلە جێبەجێ بکرێت و ڕابگەیەندرێت.




DH.MKT.01832.00034.001

| DH.MKT | 01832.00034 | 4 شەوال 1308 (13 مایس 1891) |
| --- | --- | --- |
| ویلایەتەکانی وان و موسڵ<br>ماوەی دووری قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی وان لەگەڵ ئەوێ ١٥ ڕۆژە، بەم هۆیەوە دانیشتوان دووچاری کێشە و زەحمەتی بوونەتەوە، هەروەها قەزای ناوهاتوو ٢٥ کاتژمێر لە موسڵ دوورە، بۆیە وەکو کۆن دیسان بە ویلایەتی موسڵ ببەسترێتەوە، سوودی زیاتر دەبێت، لەسەر هەندێک ووتە داواکاری بەتریقی کلدانی دەرسەعادەت دراوەتە نەزارەتی دادی شکۆدار، ئەم ڕاپۆرتەی بە نووسراو ڕەوان کراوە، وێنەیەکی بۆ عالی بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و بارودۆخەکە لەگەڵ چۆنیەتی کارەکە لە عالی خوێندنەوەی بۆ دەکرێت و بەیەکەوە ڕادەگەیەندرێت. | | |



DH.MKT.01834.00083.001

| | | |
|---|---|---|
| 11 شەوال 1308 (20 مایس 1891) | 01834.00083 | **DH.MKT** |

لایەنی والای جەنابی سەرعەسکەر
حوسێن ئاغا بەڕێوەبەری ناحیەی بەرواری سەر بە قەزای عەمادیەی ویلایەتی وان و دەستەکەی دەستدرێژیان کردۆتە سەر گوندەکانی ناحیەی مزوری سەر بە قەزای دهۆك و پارەوپول و کەلوپەلی دانیشتوانیان تالان کردووە، ئەمجارە دووبارە دەستپێشخەری هێرش کردن دەکەن، بە وەرگرتنی هەواڵ ڕێگە نەدرێت سەرپێچی ئەنجام بدرێت، ئەم هێزە زەبتیەی لە دهۆکە، وەکو هێزی پاڵپشت، لەگەڵ برێك سەربازی نیزامی پلەکانیان بەرز بکرێتەوە، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەکە بەپەلە جێبەجێ بکرێت و ئەنجامەکەی ڕابگەیەندرێت، هاوکاری سەرعەسکەر پێویستە.




| | | |
|---|---|---|
| 11 زیلحیجە 1308 (18 تەمموز 1891) | 02572.00025 | ŞD |

پوختەی ئەوراق

بریار بوو هێڵی تەلەگراف لە نێوان قەزای عەمادیە و ویلایەتی وان درێژ بکرێتەوە، بۆیە هەرچی زووە درێژ بکرێتەوە و خەرجیەکەی دابین بکرێت.




BEO.000032.002364.025

| BEO | 000032.002364 | 28 زیلقەعدە 1309 (24 حوزەیران 1892) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

بۆ ئەوەی قەزای عەمادیە نەبەستڕێتەوە بە موسڵ، لەلایەن هەندێك كەسەوە تەلەگرافنامە رەوان دەكرێت، بەڵام دانیشتوان ئاگادار نین، داهاتی میری بە تەواوەتی رادەست نەکراوە و دانیشتوانیش بۆ شوێنێکی تر خانەکانیان دەگوازنەوە، راگەیەندراوە.

حەبۆ بریکاری میللەتی موسەوی/ یوسف بریکاری میللەتی عیسەوی / ئیسماعیل بریکاری گشت دانیشتوانی ئیسلام


İ.ŞD.00114

| 25 جەمادی کۆتایی 1309 (26 کانوونی دووەم 1892) | 00114.006849 | İ.ŞD |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بەهۆی فراوانی و گرنگی جوگرافی قەزاکانی عەمادیە و مەحمودی سەر بە سانجەقی هەکاری ویلایەتی وان، بۆ هەر یەکە لە مەرکەزەکانی قەزاکانی ناوهاتوو فەرمانگەیەکی شارەوانی لە سەرۆك و ئەندامەکانی دروست بکرێت، دوای دامەزراندنیان لە مێژووی دەست بە کاربوونیان هەروەها ئەوەی پەیوەستە بە جۆر و بری رسوماتی خەزینە و شارەوانی قەزاکانی ناوهاتوو رۆژانەیان رەوان دەکرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو لە بارەی دامەزراندنی فەرمانگەکانی ناوهاتوو بە هاوکاری جەنابی پاشاوە دەبێت، بۆ جێبەجێ کردنەکەشی ئاماژە دراوەتە ویلایەت و زانیاری دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار و نەزارەتی دارایی سەروو، مەزبەتە لە فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەت رێکخراوە بە هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی کارەکە جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم و یاوەری


İ.MMS.00123

| İ.MMS | 0123.005320 | 16 سەفەر 1309 (21 ئەیلوول 1891) |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بۆ دووبارە بەستنەوەی قەزای عەمادیە سەر بە سانجەقی هەکاری بە ویلایەتی موسڵ، مەزبەتە لە فەرمانگەی ناوەخۆی ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکانی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.

سەدری ئەعزەم



Y.A.HUS 253/27

Y__A___HUS_.00253.00027.001

<table>
<tr><th>Y.A.HUS</th><th>00253.00027</th><th>6 ڕەبیعی کۆتایی 1309 (9 تشرینی دووەم 1891)</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٣<br>هەرچی زووە بڕیاری درێژکردنەوەی هێڵی تەلەگرافی قەزای عەمادیە و گشت خاڵەکانی تر جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش تەلەگرافنامەی ویلایەتی وان وەکو پایەی عالی بڕیار و فەرمانی جێبەجێکردنی دەرکردووە، لەسەر نووسراوی بری تێچووی کارەکە لەگەڵ نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە گفتوگۆ کراوە و مەزبەتە لە شورای دەوڵەت دراوەتە قەڵەم، دواتر لە ئەنجوومەنی بریکارەکان خوێندنەوەی بۆ کراوە، قەزای ناوهاتوو و گشت خاڵەکان گرنگی بازرگانی نییە، بۆیە گرنگی سیاسی هەڵدەبژێردرێت و تێچووەکەشی وەکو ئەوە نییە ئاماژەی پێکراوە، لەم حاڵەتەدا بۆ درێژکردنەوەی هێڵەکانی ناوهاتوو ئەم سوودەی لە ویلایەت ئاماژەی پێکردووە لەگەڵ بری تێچووەکەی گونجاو نییە، لەگەڵ ئەمەش لە ڕۆژانی ڕابردوو بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە قەزای عەمادیە بە ویلایەتی موسڵ ببەسترێتەوە، ئێستاش لەوێ درێژکردنەوەی هێڵی تەلەگراف چاوپۆشی لێ بکرێت و زانیاری بدرێتە نەزارەتی تەلەگراف، هەروەها ئاگاداری بدرێتە نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار، بە هومایۆنی شاهانە ڕابگەیەندرێت ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



İ.DH.01239

| İ.DH | 01239.097074 | 13 موحەررەم 1309 (19 ئۆغستۆس 1891) |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هەمایۆنی ئێستا
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
عومەر لوتفی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە و ئەحمەد شوکری بەگ قائیمقامی قەزای بارگیری گۆرینەوەیان پێ بکرێت، لەسەر ئاماژەی نووسراوی خۆجێی، مەزبەتەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و راگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمانی پاشای جەنابی ملوکانە چی بێت، جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم




İ.DH.01261

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01261.099078</td><td>5 ره‌جه‌ب 1309 (4 شوبات 1892)</td></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کیتابەت<br>٤٢١٢<br>ڕاگەیەندراوی بەندەمانە<br>شوێنی مستەفا عاکف بەگ میری ئاڵا لە ئاڵای ١٠٣ی ڕەدیفی عەمادیەی سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن بەتاڵە و لە شوێن ئەو شەوقی بەگ قائیمقامی ئاڵای ٤١ی نیزامیە پلەکەی بەرز بکرێتەوە و دابمەزرێت، لەسەر ڕاگەیەندراو و ڕەزامەندی سەر عەسکەر، جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، جگە لەمە ئاگاداری دراوەتە فەرمانگەی سەربازی شکۆدار، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>جەنابی شەهریاری سەر کاتیب</td></tr>
</table>




DH.MKT.01857.00096.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.MKT | 01857.00096 | 4 موحەررەم 1309 (10 ئۆغستۆس 1891) |

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
عومەر لوتفی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە و ئەحمەد شاکر بەگ قائیمقامی قەزای بارگیری گۆڕینەوەیان پێ بکرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی وان نووسراو کراوە، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوەتە قەڵەم، هاوپێچ پێشکەش کراوە، هاوکاری سەرووی پێویستە.





DH.MKT.01878.00011.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01878.00011</td><td>10 ڕەبیعی یەکەم 1309 (14 تشرینی یەکەم 1891)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی عالی<br>هەر چەند دەستپێشخەری کراوە تا قەزای عەمادیە بە موسڵ ببەسترێتەوە، بەڵام تا ئێستا لە ویلایەتی وان جیانەکراوەتەوە، بەمەش کێشە و کەموکوری دروست دەکات، لەسەر هەندێك ووتە و داواکاری بە واژووی فەرمانبەران و دانیشتوانی دەورووبەر کە ناویان تۆمار کراوە و دیاریکراوە تەلەگرافنامە دەرچووە، بۆ عالی بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین بابەتەکە خوێندنەوەی بۆ کراوە و عالی رایدەگەیەنێت.</td></tr>
</table>





DH.MKT.01893.00033.001

| DH.MKT | 01893.00033 | 21 رەبیعی کۆتایی 1309 (24 تشرینی دووەم 1891) |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی عالی<br>لەبەر فراوانی و گونجاوی شوێنی جوگرافی قەزاکانی عەمادیە و مەحمودی سەر بە سانجەقی هەکاری ویلایەتی وان، بۆ هەر یەکە لە مەرکەزی قەزاکانی ناوهاتوو فەرمانگەیەکی شارەوانی دابمەزرێت، سەرۆك و ئەندامانیشی دامەزراون و بە دەست بە کار بوونیان هەژماری خەزینە و شارەوانی قەزاکانی ناوهاتوو لە رووی جۆری باج و روسومی بە پۆستە رەوان کراوە، لە پایەی ویلایەتی ناوهاتوو نووسراو رەوان کراوە، لەگەڵ هاوپێچەوە بۆ عالی رەوان کراوە. | | |




DH.MKT.01905.00091.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01905.00091</td><td>26 جەمادی یەکەم 1309 (28 کانوونی یەکەم 1891)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی عالی<br>حەسەن ئەفەندی وەکو کاتیبی تۆماری قەزای عەمادیە دامەزراوە، لە بارەی پەسەند کردنی ئەرکەکەی نووسراوی عالی و وەرەقەی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی رۆیشتووە، بەڵام پشت بەستن بە بەندی ١٣ لە پێناسەی گشتی، دوای ئەوەی لە قۆمیسیۆنی تۆماری کەسێتی ناوەخۆ ووردبینی بۆ کراوە و تۆمار کراوە، وێنەیەکی پەسەندکراوی راستەوخۆ رەوانی تۆماری زانیاری سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی گشتی دەکرێت، لە قەڵەمی تایبەتی باس کراوە لەگەڵ وەرەقەی ناوهاتوو وێنەی مەزبەتە رەوان کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>





DH.MKT.01921.00081.001

<table>
<tr><td>DH.MEM</td><td>01921.00081</td><td>12 ره‌جه‌ب 1309 (11 شوبات 1892)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی سەروو<br>لـە رووی فراوانـی و قەبـوڵ کردنـی شـوێنی جوگرافـی قەزاکانـی عەمادیـە و مەحمـودی سـانجەقی هـەکاری، بۆ هەر یەکـە لـە مەرکـەزی ئـەم قەزایانـە فەرمانگەیەکـی شـارەوانی دابمەزرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنـی مامەڵـەکان بـە بریـاری شـورای دەوڵـەتی ویلایـەت، جەنابـی پاشـا بـە فەرمانی پاشـا رەزامەنـدی نیشـان داوە، چۆنیەتـی کارەکەش بە نەزارەتـی دارایـی راگەیەنـدراوە، بـە نووسراوێکـی بریـار و فەرمانـی همایـۆن جێبەجـێ بکرێت و هیممـەت بکرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.01942.00031.001

| DH.MKT | 01942.00031 | 23 ڕەمەزان 1309 (21 نیسان 1892) |
| --- | --- | --- |
| ویلایەتی وانی سەروو<br>لە تائیفەی موسەوی و دانیشتوانی قەزای عەمادیە پوری و سلیقوا خوا هیدایەتی داون و بوونەتە ئیسلام، نووسراو لە مێژووی ٤ کانوونی یەکەم ١٣٠٧ لە ویلایەتی سەروو هاتووە و ڕاگەیەندراوە بۆ هەر یەکەیان ١٥٠ قوروش لە موازەنەی ١٣٠٧ ویلایەت دابین بکرێت، لە بارەی تۆمارکردنی لە خشتەی خەرجی، والا ئاگادار کراوەتەوە و لە ژمێریاری نووسراو کراوە. | | |




DH.MKT.01943.00043.001

| DH.MKT | 01943.00043 | 30 رەمەزان 1309 (28 نیسان 1892) |
|---|---|---|
| لایەنی والای جەنابی سەر عەسکەر<br>لە وەرزی بەهاردا دوو بلۆکی لەشکری چوارەمی هومایۆن بۆ قەزای عەمادیە سەر بە سانجەقی هەکاری و تابورێك سەربازی نیزامیە بۆ قەزای بەیتولشەباب بروات، مەزبەتە لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو رەوان کراوە، لەگەڵ نووسراوی ویلایەتی وان بەیەکەوە پێشکەش کراوە، لە مەزبەتەی ناوهاتوو پێویستی و گرنگی بابەتەکە روون بۆتەوە و بە تێروانین لە گرنگیەکەی جێبەجێ بکرێت، سەرعەسکەر هاوکار بێت. | | |




DH.MKT.01947.00052.001

| DH.MKT | 01947.00052 | 13 شەوال 1309 (11 مایس 1892) |
|---|---|---|

ویلایەتی وانی سەروو

ئەحمەد شاکر بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە فەریزەی حەج جێبەجێ دەکات، لەبەر ئەوەی بەرەو حیجاز بەرێدەکەوێت دەبێ ئەرکەکەی بە وەکالەت بەرێوەببردرێت، لە مێژووی ٢٢ کانوونی دووەم ١٣٠٧ نووسراوی سەروو حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، لەم بابەتەدا ئەم پەراوێزە نیشان دراوە، بە تۆمار مانگانە ٢٥٠٠ قوروش بۆ ناوبراو دابین کراوە، لە بابەتی نیزامیەدا ئەوەی دەچێتە حەج و مۆڵەتی وەرگرتووە لە ماوەی مۆڵەتەکەی مووچەکەی بە تەواوەتی پێ دەدرێت و ئەم وەکیلەی لە شوێن ئەو دادەمەزرێت مووچەی پێ نادرێت، لە وەکالەتی قائیمقامیەتی ناوهاتوو کەس نییە بۆ وەکالەتکردن، لە وەڵام تەلەگرافنامە هاتووە و حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، ئەنجامی بریارەکە رادەگەیەندرێت لە وەڵامنامە نووسراو کراوە.



DH.MKT.01947.00063.001

| DH.MKT | 01947.00063 | 13 شەوال 1309 (11 مایس 1892) |
|---|---|---|

ویلایەتی وانی سەروو

مستەفا ئەفەندی ئەندامی دادگای بەرایی قەزای عەمادیە و عەبدولعەزیز ئەفەندی ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری و ئەحمەد ئەفەندی کاتیبی دادگا و پەرتۆ ئەفەندی بەڕێوەبەری دارایی و یاریدەدەرەکەی ناجی ئەفەندی بە چ جۆرێك مامەڵەی سوکایەتیان ئەنجام داوە، هۆکارەکەی دیاری بکرێت، لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، بە تێروانین لە بابەتەکە جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی.



DH.MKT.01950.00027.001

| DH.MKT | 01950.00027 | 18 شەوال 1309 (16 مایس 1892) |
|---|---|---|

لایەنی والا جەنابی سەر عەسکەر
ئەفسەرانی دەورووبەر بۆ دەستگیرکردنی پاشماوە و هەڵاتووانی سەربازی قەزای عەمادیە دەرچوون، لە بارەی لاری نەبوون و ئەنجامدانی کارەکە، لەسەر نووسراوی ١٩ حوزەیران ١٣٠٧ ژمارە ٧٤ ی سیپاهیداری عالی پێشووتر وەڵامی نووسراوی زانیاری لە ویلایەتی وان رەوان کراوە، لە بارەی راست و دروستی بابەتەکە ئاماژەی پێکراوە لێکۆڵینەوە دەکرێت.



DH.MKT.01954.00103.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01954.00103</td><td>2 زیلقەعدە 1309 (29 مایس 1892)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی سەروو<br>ئەوانەی مۆڵەتی ڕۆیشتن بۆ فەریزەی حەجی شەریف وەردەگرن مووچەکانیان بە تەواوەتی وەردەگرن، ئەوانەی بە وەکالەتیش ئەرکەکە وەردەگرن مووچە وەرناگرن، جگە لەمە گۆرینی بریارنامەی خەرجی ڕێگا دراوەتە قەڵەم، هەرچی کۆڵەکەی ماددەی شەشەم بۆ وەکالەتی قائیمقامی قەزای عەمادیە کەسێکی گونجاو نەدۆزراوەتەوە و لە مەرکەزی لیواش کەسێك ئارەزووی وەرگرتنی ئەم پۆستە ناکات، لەسەر تەلەگرافنامەی والآ لە شورای دەوڵەت ڕێکخراوە و دراوەتە فەرمانگەی قەڵەم، بە نووسراوی سەدری ئەعززەم مەزبەتە ڕۆیشتووە، ئەوانەی مانگێك مۆڵەتی چوونە حەجی شەریفیان پێدراوە، ئەوانەی وەکالەتەکە وەردەگرن بە گوێرەی نیزام گونجاو مووچە وەربگرن، لەسەر وەرنەگرتنی مووچەی وەکالەت، بە نیزام یەکێك لە بەرێوەبەری دارایی و نائیبی قەزا دابمەزرێت، نووسراو بۆ والآ کراوە و هیمەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




DH.MKT.01958.00073.001

| 12 زیلقەعدە 1309 (8 حوزەیران 1892) | 01958.00073 | DH.MKT |
|---|---|---|
| لایەنی واڵای جەنابی سەر عەسکەر<br>بەهۆی جموجۆڵی خراپی عەلی ئەفەندی بینباشی رەدیفی قەزای عەمادیە، لەلایەن فەرمانبەری مومەییەزانی قەزای ناوهاتوو تەلەگرافنامە هاتووە، هاوپێچ بۆ لایەنی سەرعەسکەر رەوان کراوە. | | |




DH.MKT.01960.00091.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01960.00091</td><td>17 زیلقەعدە 1309 (13 حوزەیران 1892)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وانی سەروو<br>بۆ فەرمانبەرانی ناسنامەی قەزای عەمادیە ژوورێکی تایبەت دابین دەکرێت، هەروەها بۆ کەلوپەلی ژوورەکە برێکی گونجاو پارە دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە موتەسەرفی هەکاری ئاماژەی پێکراوە، بۆ مامەڵەی پرس و را نووسراوی مێژووی ١ نیسان ١٣٠٨ حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، فەرمانبەرانی ناسنامە لە فەرمانبەرانی ناوەخۆن و خەرجی گەرمکەرەوە و کەلوپەلی تر لە موازەنە تۆمار کراوە، بەڵام حاڵی حازر دابین کردنی خەرجیەکە لە خەزینە گونجاو و هاوکار نییە، هەر کاتێك هاوکار بێت دابین دەکرێت، لە ساڵی ١٣٠٨ لە موازەنە پەسەند کراوە، خشتەی دابین کردنی خەرجیەکەش تۆمار کراوە و لە ژمێریاری والا ئاگادار کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




İ.AZN.00003.00030.002

| İ.AZN | 00003.00030 | 19 جەمادی کۆتایی 1310 (8 کانوونی دووەم 1893) |
|---|---|---|
| جەنابی پاشا پەیوەندیداری سەدارەت<br>لە ٢٤ کانوونی یەکەم ١٣٠٨، کاروباری مولکیە و دارایی قەزای عەمادیە بەستراوەتەوە بە ویلایەتی موسڵ، هەروەها بەهۆی دووری قەزای ناوهاتوو لە سانجەقی هەکاری پێویستە کاروباری دادیش ببەسترێتەوە بە موسڵ، راگەیەندراوە.<br>والی وان فەریق ........ | | |




DH.MKT.00020.00043.001

| DH.MKT | 00020.00043 | 9 شەوال 1310 (26 نیسان 1893) |
| --- | --- | --- |
| جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>عوسمان نوری بەگ قائیمقامی قەزای عەمادیە لە ئەرکەکەیدا کاری باشی بینراوە، بۆیە شایەنی ئەوەیە پلەی سێیەم یاخود پلەی میری میرانی پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو هاتووە لەگەڵ پۆستەی تۆماری کەسێتی بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە راگەیاندنی ئەم ئەرکانەی ناوبراو ئەنجامی داوە، گونجاوترە پلەی دووەمی پێ بدرێت، بەڵام پێویستی بە رەزامەندی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتە. | | |




BEO.000071.005317.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000071.005317</td><td>23 سەفەر 1310 (16 ئەیلوول 1892)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆ و دارایی<br>بە گوێرەی ئەم نووسراوەی وێنەیەکی لە بالآدا تۆمارکراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئاماژە دراوەتە نەزارەتی دارایی پایەبەرز، لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.<br><br>لە قەزای عەمادیە دوو کەس خوا هیدایەتی داون، لە بارەی ئەم برە پارەیەی کە پێویستە پێیان بدرێت.</td></tr>
</table>



İ.DH.01504

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01504.000014</td><td>12 موحەڕرەم 1332 (11 کانوونی یەکەم 1913)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران<br>ژمارە ٢٥٢٣<br>فەرمانی پاشا<br>محەمەد عەلی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە و عەبدولمەجید ئەفەندی قائیمقامی قەزای گوڵعەنبەر بەم مووچەی وەریدەگرن گۆرینەوەیان پێ بکرێت.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نەزارەتی ناوەخۆ ئەرکی پێدراوە.<br>نازری ناوەخۆ/سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



ŞD.02209.00016.002

| 21 زیلقەعدە 1332 (11 تشرینی یەکەم 1914) | 02209.00016 | ŞD |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>ئـەم کاتـەی محەمـەد عەلـی ئەفەنـدی قائیمقامـی پێشـووی قـەزای گوڵعەنبـەر لـە قائیمقامیەتـی عەمادیـە بـووە، بابەتـی جۆراوجـۆری خراوەتـە پاڵیـەوە، بـەڵام بـۆ ڕێگەگرتـن لـە دادگاییکردنـی ناوبـراو، مەزبەتـە لـە فەرمانگـەی مولکیـە و مەعاریـف ڕێکخـراوە لەگـەڵ بەرایيەکانـی بـۆ ویلایەتـی موسـڵ نێـردراوە تـا بـۆ پەیوەندیـداری نـەزارەت بـەرز بکرێتـەوە. | | |






Y.PRK.ASK.00086.00008.001

| Y.PRK.ASK | 00086.00008 | 1 ڕەبیعی کۆتایی 1310 (23 تشرینی یەکەم 1892) |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی مەکتوب
تایبەتی

لە عەمادیەیە، تا ئاسایشی ناوچەکە جێگیر بکات، بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لە ٢٥ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٠ ڕەزامەندی نیشان داوە، تابوری ٢ی ئاڵای ٤٧ هاتۆتە موسڵ تا بچێتە سنجار، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك لە موسڵ پشوو دەدەن، دواتر دەچێتە سنجار، تەلەگرافنامە لە قوماندانیەتی فرقەی سەڵاحیە هاتووە و بابەتەکە ڕوون بۆتەوە و ڕاگەیەندراوە، بۆ ڕاگەیاندنی نووسراوەکانیش نووسراو کراوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.
ڕزا سەر عەسکەر




BEO.000117.008755.001

<table dir="rtl">
<tr><th>BEO</th><th>000117.008755</th><th>15 جەمادی یەکەم 1310 (5 کانوونی یەکەم 1892)</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>گۆڕینەوە بە ئەرکەکانی عوسمان نوری ئەفەندی و شاکر ئەفەندی قائیمقامەکانی دهۆك و عەمادیە سەر بە ویلایەتی موسڵ دەکرێت، لەسەر نووسراوی مێژووی ١٧ رەبیعی کۆتایی ١٣١٠ ژمارە ١٤٦٠ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>




BEO.000134.010030.001

| BEO | 000134.010030 | 16 جەمادی کۆتایی 1310 (5 کانوونی دووەم 1893) |
|---|---|---|
| ویلایەتەکانی موسڵ و وان<br>بەهۆی دووری قەزای عەمادیە لە وان، لەگەڵ کاروباری مولکیە و سەربازی، مامەڵەی دادیش بە موسڵ ببەسترێتەوە، بە ئاماژەی داواکاری گشتی وان بە میهرەبانیەوە بە نەزارەتی داد راگەیەندراوە، خوێندنەوەی بۆ بکرێت و رابگەیەندرێت. | | |




BEO.000156.011640.001

| BEO | 000156.011640 | 29 ڕەجەب 1310 (16 شوبات 1893) |
|---|---|---|
| نەزارەتی دادی شکۆدار<br>وێنەی تۆمارکراوی لە باڵادا ڕاگەیەندراوە، بە گوێرەی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لە نەزارەتی دادی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.<br><br>کاروباری مولکیە و دارایی، لەگەڵ کاروباری دادی قەزای عەمادیە ببەسترێتەوە بە موسڵ. | | |




BEO.000158.011792.001

| BEO | 000158.011792 | 4 شەعبان 1310 (21 شوبات 1893) |
| --- | --- | --- |
| شیفرە بۆ ویلایەتی وان و موسڵ<br>چالی ئاغا لە عەشیرەتی بلباس سەر بە وان، لەلایەن سەعدی ئاغا هان دراوە و بە ٢٠٠ کەس هێرشیان کردۆتە سەر گوندی حەجەری سەر بە قەزای عەمادیە و ٨ نەفەریان کوشتوە و کەلوپەل و پارەوپولیان دزیوە، بە واژووی ئیلیا بەتریقی کلدانی لە موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە، ئاماژەی بەم رووداوە کردووە، راستی بابەتەکە روون بکرێتەوە و رابگەیەندرێت، لە ویلایەتی موسڵ پرسیار کراوە. | | |



| 10 زیلحیجە 1310 (25 حوزەیران 1893) | 000227.016960 | BEO |
| --- | --- | --- |

لایەنی والای سەرعەسکەر
لە سانجەقی هەکاری لە نێوان نەتەوەی نەستوری و تەیاری لەگەڵ عەشیرەتی هەرکی دوژمنایەتی هەیە، لە ئەنجام هێرش و کوشتن و رووداو کەمی نەکردووە، بۆ گەڕانەوەی کەلوپەلە تالانکراوەکان و پاراستنی ئاسایش، تابورێکی موسڵ بۆ عەمادیە بچێت، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە و بۆ سەروو رەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.00242.00036.001

| DH.MKT | 00242.00036 | 23 زیلقەعدە 1310 (8 حوزەیران 1893) |
| --- | --- | --- |

جەنابی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
تەها ئەفەندی لە گوندی مالی سەر بە ناحیەی بەرواری قەزای عەمادیە خانەکەی کردۆتە مەدرەسە و تێدا خەریکی وانە ووتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانستە، لەبەر ئەوەی هیچ شتێکی نییە بژێوی ژیانی خۆی پێ دابین بکات، تووشی هەژاری و دەستکورتی بۆتەوە، خەڵکی نەزان و کۆچەری سوود لە زانست و زانیاریەکانی وەردەگرن، بۆیە شایەنی ئەوەیە سەدەقەی پێ بدرێت، مووچەیەکی گونجاوی بۆ دابین بکرێت، لەسەر هەندێك ووتە لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ مەزبەتە لە مێژووی ٢٩ مارت ١٣١٠ رەوان کراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەکە پێویستی بە هاوکاری جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتە.




İ.DH.01300

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01300.000028</td><td>11 جەمادی یەکەم 1310 (1 کانوونی یەکەم 1892)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>١٣١٠<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵ گۆرینەوە بە عوسمان نوری ئەفەندی و شاکر ئەفەندی قائیمقامەکانی دهۆك و عەمادیە بکرێت، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمانی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم و یاوەری</td></tr>
</table>




DH.MKT.02018.00066.001

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>02018.00066</th><th>17 رەبیعی کۆتایی 1310 (8 تشرینی دووەم 1892)</th></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لە ویلایەتی موسڵ بە تەلەگراف ئاماژەی پێکراوە، گۆرینەوە بە عوسمان نوری ئەفەندی و شاکر ئەفەندی قائیمقامەکانی دهۆك و عەمادیە بکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران پێشکەش کراوە و بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە هاوکاری جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت پێویستە.</td></tr>
</table>




DH.MKT.02022.00098.001

| DH.MKT | 02022.00098 | 29 رەبیعی کۆتایی 1310 (20 تشرینی دووەم 1892) |
|---|---|---|
| نەزارەتی تەندروستی شکۆدار<br>بە بۆنەی سەرهەڵدانی کۆلێرا لە وان، پاراستنخانە لە قەزاکانی عەمادیە و زاخۆ لەگەڵ ناحیەی سینس گلی دامەزرێت، لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی شکۆدار ئاماژەی پێکراوە، بە تێروانین لە بەراییەکان تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە و بۆ عالی رەوان کراوە، بە تێروانین لە بەراییەکان جێبەجێ بکرێت. | | |






ŞD.02609.00027.003

| ŞD | 02609.00027 | 12 رەجەب 1310 (30 کانوونی دووەم 1893) |
|---|---|---|

جەنابی پاشا پەیوەندیداری سەدارەت

لە ٢٤ کانوونی یەکەم ١٣٠٨، لەسەر هاتنی فەرمانی پاشای تاجدار، کاروباری مولکیە و دارایی بەستراوەتەوە بە ئێرە، قەزای عەمادیە نزیکە لە موسڵ و دوورە لە ویلایەتی وان، هەروەها دانیشتوانی قەزاکە و دانیشتوانی موسڵ بەیەکەوە نیشتەجێن و لە یەکتر نزیکن، بۆیە لایەنی دادیش بە موسڵ ببەسترێتەوە و بە هەموو شێوەیەك سوود و ئامانجی جۆراوجۆری دەبێت، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری شکۆداری پێویستە، راگەیەندراوە فەرمان.

عوسمان والی موسڵ



DH.MKT.00098.00039.003

| DH.MKT | 00098.00039 | 17 موحەررەم 1311 (31 تەمموز 1893) |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>نەزارەتی کاروباری دەرەوە<br>ژووری وەرگێران<br>لە مێژووی ٣ تەمموز ١٣٠٩ تەلەگرافنامە بە زەمانی عەرەبی و بە واژووی باڵا رەشید بەرێوەبەری ناحیەی بەرواری و ئەندامان محەمەد و رەسول بریکاری دانیشتوان و ١٤ هاوەڵ لە مەرکەزی باستکە پێشکەشی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە.<br><br>قەزای عەمادیە کە بە وان بەسترابووەوە ئەمنیەتی باش بوو، بەم دواییە بەستراوەتەوە بە ویلایەتی موسڵ و عوسمان نوری ئەفەندی کراوەتە قائیمقام، کەچی بارودۆخی قەزاکە خراپ بووە و ئەمنیەت و ئاسایشی تێکچووە، تا ئێستا ٣٥ کوژراوە و ٥٠٠٠ مەڕ تاڵان کراوە، هەر لەم رۆژەوە ناوبراو وەکو قائیمقام دامەزراوە، بەڵام پارەی خەڵکی خواردووە و چەند جارێك بە تەلەگرافنامە راگەیەندراوە، ئەگەر دانیشتوان بوونەتە دیلی قائیمقام بارودۆخمان رادەستی جەنابی دادپەروەر دەکەین، پێویستە عالی هاووڵاتی خۆی لەم جۆرە کەسانە و شەری ئەم کەسانە رزگار بکات، تکایە فەرمان. | | |




DH.MKT.00114.00040.001

| DH.MKT | 00114.00040 | 6 سەفەر 1311 (19 ئۆغستۆس 1893) |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی شکۆدار
عوسمان نوری بەگ قائیمقامی عەمادیە لە خەزینەی شکۆدار ۱۲۷۰۰۰ قوروش قەرزی هەیە، بەم هەواڵە چارەگێك مووچەی ناوبراو دەستی بەسەر داگیراوە، بەڵام ئەم کارە نەبووتە رزگار بوونی، بۆیە تاهیر عەونی ئەفەندی خانەدانی قارس داواکاری بەرز کردۆتەوە، کارەکە جێبەجێ بکرێت.




DH.MKT.00183.00039.002

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>00183.00039</th><th>9 جەمادی کۆتایی 1311 (18 کانوونی یەکەم 1893)</th></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>عوسمان نوری ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە بە گشتی لە رووی ئیداریەوە بەڕێوەبردنی خراپە و مانەوەی لە ئەرکەکەی گونجاو نییە، دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو مستەفا سالم ئەفەندی قائیمقامی زاخۆ، بۆ قائیمقامیەتی زاخۆش ئیبراهیم بەگ هەڵبژێردراو لە چینی دووەم دابمەزرێن، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە، مەزبەتەش دراوەتە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی هاوکاری جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەتی دەوێت.</td></tr>
</table>



| 17 زیلقەعدە 1311 (22 مایس 1894) | 00199.00027 | DH.MKT |
|---|---|---|

بریکاری سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار
لێکۆڵینەوە لە خراپ و کەموکوری عوسمان نوری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە کراوە و ئەوراقەکانی رەوان کراوە، لەسەر نووسراوی ١١ نیسان ١٣١٠ ژمارە ١٧ ی عالی، عوسمان نوری ئەفەندی لە قۆمیسیۆن ووتەی وەرگیراوە و لەسەر لێکۆڵینەوە و وەرگرتنی ووتەکانی نووسراو رێکخراوە و رەوان کراوە، بە ناردنەوەی ئەوراقەکان بەیەکەوە بۆ سەروو رەوان بکرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.MKT.00238.00059.002

| | | |
|---|---|---|
| 15 زیلقەعدە 1311 (20 مایس 1894) | 00238.00059 | DH.MKT |

ویلایەتی موسڵی شکۆدار
بەهۆی کار و خزمەتە باشەکانی رزا ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی داودەی سەر بە قەزای عەمادیە نووسراوی عالی لە مێژووی ٢٥ مارت ١٣١٠ ژمارە ٢ هاتووە و لە بارەی پاداشت کردنی بە پلەی چوارەم رەزامەندی نیشان داوە، چۆنیەتی کارەکە بۆ کارگێری گشتی تۆماری کەسێتی بەرز کراوەتەوە، بەڵام کەسێك بەم ناوە و بەم ئەرکە نییە و نەدۆزراوەتەوە، بەڵکو لە تۆمارەکان کەسێك بە ناوی عەلی رزا ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی کێلی ویلایەت ناوی هەیە، لە بارەی پاداشت کردنی ئەم کەسە نازانرێت خۆیەتی یا خۆی نییە، لێکۆڵینەوە بکرێت و رابگەیەندرێت.




DH.MKT.00252.00020.001

| DH.MKT | 00252.00020 | 22 زیلحیجە 1311 (26 حوزەیران 1894) |
|---|---|---|

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی محەمەد ئەفەندی زادە عەلائەددین ئەفەندی لە گوندی بامەرنی سەر بە قەزای عەمادیە، بژێوی ژیانی خراپە، برێکی دیاری کراو مووچەی بۆ بڕێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار نووسراو لە مێژووی ٧ مایس ١٣١٠ هاتووە و لەگەڵ هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت بریاری لەسەر دەدات.




BEO.000306.022935.002

| BEO | 000306.022935 | 22 رەبیعی کۆتایی 1311 (2 تشرینی دووەم 1893) |
| --- | --- | --- |

جەنابی سەدارەتی پایەبەرز
لە ٢٠ تشرینی یەکەم ١٣٠٩ قائیمقامی عەمادیە بۆ رۆیشتن هەوڵ و کۆششی داوە، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو بۆ ویلایەتەکانی حەلەب و دیاربەکر کراوە، ناوبراو لە دانیشتوانی قارسە، بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەرزروم بچێتە دەرسەعادەت، لەم بابەتەدا فەرمانی پیویست بدرێتە ویلایەتی ئەرزروم،
عەزیز والی موسڵ



| 17 جەمادی کۆتایی 1311 (26 کانوونی یەکەم 1893) | 000334.024989 | BEO |
| --- | --- | --- |
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>عوسمان نوری ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو مستەفا سالم ئەفەندی قائیمقامی زاخۆ، بۆ قائیمقامی زاخۆش ئیبراهیم بەگ کە لە قائیمقامیەتی بازیان دابراوە دابمەزرێن، لەسەر نووسراوی مێژووی ٩ جەمادی کۆتایی ١٣١١ ژمارە ٦٧٣، لە مێژووی ١٥ جەمادی کۆتایی هەمان ساڵ ڕەزامەندی نیشان دراوە، بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |



BEO.000366.027425.001

| | | |
|---|---|---|
| 21 شەوال 1311 (27 نیسان 1894) | 000366.027425 | **BEO** |

نەزارەتی دادی شکۆدار
لە عەمادیە مادمەزێل ملتون لە میسیۆنەکانی ئەمەریکا نیمچە بریندار کراوە و کەلوپەلی دزراوە، دادگا کاری خۆی کردووە، لەسەر ئەم تاوانە ١١ کەس گومانیان لەسەرە و بریاری لەسەر دراوە، بریارنامە و پروپاگەندەنامەکان رەوانەی دەستەی تاوانبارانی بەغداد کراوە، لە ئاماژەی ویلایەتی موسڵ روون بۆتەوە، هەروەها ئەم کارە پێویستە بە پەلە جێبەجێ بکرێت و کارەکە کۆتایی پێ بهێنرێت، بۆ ئەم مەبەستەش بە تەلەگرافنامە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار ئاگادار کراوەتەوە، فەرمانبەرانی دادی بەغداد بەم رێگەیەوە هیممەت بکەن لە جێبەجێ کردنی رێنماییەکان.




BEO.000413.030931.001

| BEO | 000413.030931 | 26 زیلقەعدە 1311 (31 مایس 1894) |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>تەها ئەفەندی بە وتنەوەی وانە و زانست سەرقاڵە و خانەکەی لە گوندی مالی سەر بە قەزای عەمادیە کردۆتە مەدرەسە، بەهۆی هەژاری و دەستکورتی مووچەیەکی دیاریکراوی بۆ دابین بکرێت، ئەم مەزبەتەی لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ رەوان کراوە، نووسراو لە مێژووی ٢٣ زیلقەعدە ١٣١١ ژمارە ٨٠٥ ی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هاتووە، بۆ دەوڵەت رەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |



| BEO | 000427.031963 | 23 زیلحیجە 1311 (27 حوزەیران 1894) |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>لە شێخەکانی پۆست نشینی تەریقەتی نەقشبەندی محەمەد ئەفەندی زادە عەلائەددین ئەفەندی لە گوندی بامەرنی سەر بە قەزای عەمادیە بژێوی خراپە، لە بارەی برینەوەی مووچەیەکی دیاریکراو نووسراو لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، نوسراوی مێژووی ٢٢ زیلحیجە ١٣١١ ژمارە ١٠٧٠ ی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بۆ دەوڵەت رەوان کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکریت لە جێبەجێ کردنی. | | |



İ.DH.01310

| (1893 کانوونی یەکەم 21) 1311 جەمادی کۆتایی 12 | 01310.000023 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٤٥٣
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
عوسمان نوری ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ لە بەڕێوەبردن خراپە، بۆیە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو مستەفا سالم ئەفەندی قائیمقامی زاخۆ، لە قائیمقامیەتی زاخۆش هەڵبژێردراو لە چینی دووەم ئیبراهیم بەگ دوورخراوە لە قائیمقامی بازیان دابمەزرێت، لەسەر ئاماژەی ناوەخۆ نووسراو کراوە، مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم و یاوەری



| DH.MKT | 00286.00034 | 8 جەمادی کۆتایی 1312 (7 کانوونی یەکەم 1894) |
|---|---|---|
| جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لە نێوان تەیاریەکان و بەرواریەکان ساردی و دوژمنایەتی هەبووە، لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی قەزای عەمادیە بەهائەددین ئەفەندی و عەلائەددین ئەفەندی رۆڵیان گێراوە لە ئاشتکردنەوەی نێوانیان و نەهێشتنی ئەم دوژمنایەتیە، بۆیە بە نیشان پاداشت بکرێت، بۆ ئەمەش وەڵام لە ویلایەتی موسڵ بە دوو نووسراوی مێژووی ١٣ ئۆغستۆس ١٣١٠ و ٢٢ تشرینی یەکەم هەمان ساڵ پێشکەش کراوە، ناوبراوان لە پلەی پێنجەم هەر یەکە نیشانێکی مەجیدیان پێ بدرێت، بەڵام هاوکاری پەیوەندیداری سەدارەتی دەوێت. | | |




<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01323.000035</td><td>10 زیلقەعدە 1312 (5 مایس 1895)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٣٠٣٨<br>جەنابی میهرەبانی ئەفەندم<br>لە خۆجێی سکاڵا لەسەر عوسمان ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ بەرز کراوەتەوە، لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەی کراوە دەرکەوتووە، ناوبراو هەژماری سەرمەڕی زیاد کردووە و زیانی بە دانیشتوان گەیاندووە، جگە لەمە هەندێکیانی دارکاری کردووە و زیندانی کردوون، هەندێکیشی بە زۆرەملێ پارەی لێ وەرگرتوون، ئەم کاروکردەوانەی بە بەڵگە سەلمێنراوە، بۆ دادگاییکردنی ئاگاداری بدرێتە ویلایەت، بۆ ئەمەش نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە، مەزبەتەی فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم و یاوەری</td></tr>
</table>




تلغراف نامه‌سی

شورای دولت ریاست جلیله‌سنه



ŞD.02968.00055.003

| ŞD | 02968.00055 | 5 رەمەزان 1312 (2 مارت 1895) |
| --- | --- | --- |
| سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار<br>لە ١٣ شوبات ١٣١٠، ئەمجارە ئەوراقی لێکۆڵینەوەی عوسمان ئەفەندی قائیمقامی پێشووی عەمادیە دراوەتە پۆستە، راگەیەندراوە.<br>عەزیز والی موسڵ | | |


A.}MKT.MHM.00669.00011.001


A.}MKT.MHM.00669.00011.002

| A.MKT.MHM | 00669.00011 | 4 رەبیعی یەکەم 1314 (13 ئۆغستۆس 1896) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
لە ناوچەکانی وان و دەورووبەری نزیکەی ٢٠٠٠ ئەرمەنی چوونەتە چیاکانی تەیارە و قەبیلەی تەیارییەکانیش رایانگەیاندووە تا ئەرمەنەکان چەك رادەست نەکەن، لەلای خۆیان قەبوڵی ناکەن، هەروەها پێشبینی دەکەن کوردەکانی عەمادیە هێرش بکەنە سەر دانیشتوانی کرستیان، بەم هەواڵە زانیاری ویلایەت ئاماژەی پێکراوە.

| A.MKT.MHM | 00669.00011 | 10 رەبیعی یەکەم 1314 (19 ئۆغستۆس 1896) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پیرۆز
قەڵەمی مەکتوب/ تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ویلایەتی موسڵ هاتووە
لە نێوان دانیشتوانی ئیسلامی و مەسیحیەکانی عەمادیە ئەمنیەت نەبووە، ئەمەش بۆتە جێگەی ئەندێشە، بەڵام هیچ بارودۆخێك رووی نەداوە و ئاسایشی ناوچەکەش لە شوێن خۆیەتی، هەرچی تەیارەکانە لە قەزای چۆڵەمێرگی ویلایەتی وان بوونیان هەیە، پێویستە لە شوێن خۆیدا لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت و لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لە قائیمقامیەتی عەمادیە پرس و را کراوە، وەڵامەکەشی ناردووە، فەرمان.
عەبدوڵلا والی



| | | |
|---|---|---|
| 23 سەفەر 1314 (3 ئۆغستۆس 1896) | 00694.00013 | **A.MKT.MHM** |
| وەکالەتی والی موسڵ/ تەلەگرافنامە<br>لە بارەی مەکتەبەکانی عەمادیە کە لە تەلەگرافنامەکەی ١٩ تەمووز ١٣١٢ باس کراوە، مەبەستتان روون نەبۆتەوە، روون بکرێتەوە. | | |

BEO.000838.062786.001

| BEO | 000838.062786 | 4 رەبیعی کۆتایی 1314 (12 ئەیلوول 1896) |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی شکۆدار
تاهیر ئەفەندی لە گوندی مالی سەر بە قەزای عەمادیە بە بڵاوکردنەوەی زانست خەریکە، بەهۆی خراپی بژێوی ژیانی، لە خەزینەی شکۆدار وەکو ئەوانی خۆی یا لە ئاوقافی گشتی مووچەیەکی گونجاوی بۆ دابین بکرێت، لە والی ویلایەتی موسڵ نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار رەوان کراوە، لەگەڵ نووسراوی ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٤ ژمارە ٢٤٨٧ ی نەزارەتی ناوهاتوو هاوپێچ بۆ سەروو رەوان کراوە، جێبەجێ بکرێت و هیممەت بکرێت لە ناردنەوەی نووسراوی ناوهاتوو.



BEO.000963.072189.006

| BEO | 000963.072189 | 23 شەوال 1314 (27 مارت 1897) |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی مەکتوب
تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار ڕەوان کراوە لە بارەی گواستنەوە و گۆڕینەوەی قائیمقامی قەزاکانی عەمادیە و عەقرە و ڕانیە، تەلەگرافی ٨ شوبات ١٣١٢ وەڵام نەدراوەتەوە و ڕەزامەندی ئەنجام دانی کارەکە نەدراوە، لە هەندێک قائیمقامی قەزا ناوهاتووەکان هەستاون بە کۆکردنەوەی زانیاری ناوچەکان و بۆ مانەوەیان لە دانیشتیوان مۆری مانەوەیان کۆکردۆتەوە، ئەمەش دەبێتە نموونەیەکی خراپ بۆ ئەوانی تر، بە ئاماژەی پێشوو بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و بە تەلەگراف بڕیار و ئاماژەی پێ بکرێت، تکا کراوە فەرمان.
زوهدی

DH.ŞFR.00211.00043.001

DH.ŞFR.00211.00043.001

| DH.ŞFR | 00211.00043 | 2 سەفەر 1315 (3 تەمموز 1897) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە بارەی قائیمقامەکانی عەمادیە و عەقرە و رانیە لە مێژووی ٨ شوبات ١٣١٢ تەلەگرافنامە پێشکەش کراوە، تێدا روون بۆتەوە کارگێری ئەمانە لە ژێر هەرەشە دایە، لە تەلەگرافنامەی ناوهاتوو راگەیەندراوە ئەمساڵ باجی سەرمەڕی قەزای رانیە بەشێوەیەکی خراپ مامەڵەی پێوە کراوە، بریکاری قائیمقام و بەرێوەبەری دارایی دوورخراونەتەوە، بە رێگەی فەرمانبەر لێکۆڵینەوە کراوە، لە قەزاکانی تریش لێکۆڵینەوە بکرێت. | | |




BEO.001082.081120.001

| BEO | 001082.081120 | 30 ڕەمەزان 1315 (22 شوبات 1898) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
عوسمان نوری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی عەمادیە لە قائیمقامیەتی قەزای یەنی فارۆش سەر بە ویلایەتی قوسوە دادەمەزرێت، لەسەر نووسراوی ١٧ ڕەجەب ١٣١٥ ژمارە ٣٦٨٢ لەگەڵ بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە، لە مێژووی ٢٥ ڕەمەزان ١٣١٥ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.


İ.DH.01354

| İ.DH | 01354.000022 | 15 زیلقەعدە 1315 (7 نیسان 1898) |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٣٢٠٤<br>جەنابی میهرەبانی ئەفەندم<br>بەهۆی گەورەیی و گرنگی مەرکەزی قەزای عەمادیە نرخ و پێداویستییەکان سەیر بکرێن، هەروەها لە بارەی بریاری پاککردنەوەی نرخ و نۆژەنکردنەوەی خۆجێی بە ناوی خەزینەی شکۆدار پرس کراوە، داهاتی ساڵانەی رسوماتی قنتار و ئاژەڵ لە ١٦٥٠ قوروش بە فەرمانی تایبەتی نیوەی بەجێ بهێڵدرێت و وەکو مەرکەزی قەزاکانی تر مەرکەزی قەزای عەمادیەش لە شارۆچکەی عەمادیە فەرمانگەیەکی شارەوانی دامەزرێت، ئەم کارە لە ویلایەتی موسڵ بە پێویست زانراوە، هەروەها لە قەزای ناوهاتوو بە گونجاو زانراوە فەرمانگەیەکی شارەوانی دامەزرێت، لە نەزارەتی دارایی شکۆداریش پەسەند کراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی بە ویلایەت وتراوە، حەواڵەی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار کراوە و زانیاری دراوەتە نەزارەتی ناوهاتوو، مەزبەتەی فەرمانگەی مولکیەی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم | | |




İ.AS.00027.00073.001

<table>
<tr><td>İ.AS</td><td>00027.00073</td><td>8 زیلحیجە 1316 (19 نیسان 1899)</td></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کیتابەت<br>٣٩٩٠<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>میری ئاڵای عەلی رزا بەگ لە ئاڵای رەدیفی ١٠٣ی عەمادیە سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن، بە پلەی میری لیوا لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢ی لەشکری ناوهاتووی لیوای ٢٣ دادەمەزرێت، چونکە ئەرکەکە بەتاڵە، لەسەر راگەیاندن و ئاماژەی والای سەر عەسکەر، فەرمانی پاشا لەلایەن جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.</td></tr>
</table>



İ.TAL.00148.00020.002

| 9 رەبیعی یەکەم 1316 (28 تەمموز 1898) | 00148.00020 | İ.TAL |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٧٤٧
جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
عوسمان نوری بەگی قارسلی قائیمقامی پێشووی عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ بەهۆی خزمەتە باشەکانی شایستەی پاداشتکردنە و بۆ پلەی دووەم لە چینی موتەمایز پلەکەی بەرز بکرێتەوە، لەم بارەیەوە نووسراوی نەزارەتی دارایی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا بریاری چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
1478 | 20 | 2

ŞD.01478.00020.002

| 11 موحەررەم 1316 (1 حوزەیران 1898) | 01478.00020 | ŞD |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بەهۆی گرنگی شوێنی جوگرافی هێڵی تەلەگرافی سانجەقەکانی سنجار و عەمادیە پێویستی بە درێژکردنەوەیە، لە تەلەگرافی ٢٦ نیسان ١٣١٤ مەرکەزەکەی راگەیەندراوە، ئەمجارە مەزبەتە لە ئەنجوومەنی کارگێری عەمادیە راگەیەندراوە، خەرجیەکەی لە رێگەی هاوکاری دابین بکرێت، مەرکەزی تەلەگرافیش بە خۆرایی دروست بکرێت، هەروەها مەرکەزی سنجار بە خەرجیەکی کەم دروست دەکرێت، بەم تێروانینە بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت، داواکراوە.<br>عەبدولوەهاب والی موسڵ | | |




٤٥٢١

İ.AS 29/37

İ.AS.00029.00037.001

| İ.AS | 00029.00037 | 19 جەمادی یەکەم 1317 (25 ئەیلوول 1899) |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٤٥٢١
راگەیەندراوی بەندەمانە
قوماندانیەتی ٥١ ی رەدیفی لیوای کەرکووك سەر بە لەشکری شەشەمی هومایۆن بەتاڵە، ئیسماعیل بەگ میری ئالای ١٠٣ ی رەدیفی عەمادیە پلەکەی بەرز بکرێتەوە و ئەرکەکەی پێ بدرێت، لەسەر نووسراوی سەر عەسکەر جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
شەهریاری سەر عەسکەر


DH.MKT.02204.00053.001

| DH.MKT | 02204.00053 | 7 موحەررەم 1317 (18 مایس 1899) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵی عالی
شوکری ئەفەندی کاتیبی ناسنامەی قەزای عەمادیە دوور خراوەتەوە و لە شوێنی ئەو عەبدوڵلا ئەفەندی دامەزرێت، لەسەر نووسراوی مێژووی ١٦ کانوونی دووەم ١٣١٤ ژمارە ١٦٤ ی ویلایەت جێگیر کراوە، ناوبراو لەگەڵ دەست بە کار بوونی مانگانە ١٢٥ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، بە ووتەی ژمێریاری مێژووی دەست بە کاربوون و دەست لە کارکێشانەوەی رابگەیەندرێت.




İ.ML.00042.00001.003

| İ.ML | 00042.00001 | 19 ڕەمەزان 1318 (10 کانوونی دووەم 1901) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٧١٥
جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
لەسەر ئەم نووسراوەی کە لە نەزارەتی دارایی شکۆدار بۆ شورای دەوڵەت ڕەوان کراوە، مەزبەتە لە فەرمانگەی دارایی ڕێکخراوە و پێشکەش کراوە، لە ویلایەتی موسڵیش کۆتایی پێ هاتووە، مامەڵەی هەمیشەیی شارۆچکەی عەمادیە لەگەڵ ٦٣ گوند لەسەر جێبەجێ کردنە، ئەم قەزایە وەکو قەزایەکانی تر مانگانە بە مووچەی ٣٠٠ قوروش کاتبێکی باج دابمەزرێت، هەروەها مووچەی ناوهاتووش لە بودجەی ئەم ساڵ لە مێژووی دەست بە کاربوونی دابین بکرێت و حەوالەی نەزارەتی ناوهاتوو بکرێت، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمانی هومایۆنی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.



| BEO | 001580.118479 | 18 رەجەب 1318 (11 تشرینی دووەم 1900) |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی شکۆدار

وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٧ رەجەب ١٣١٨ ژمارە ١٨٢٩ ی دەوڵەتە، عوسمان نوری بەگ قائیمقامی پێشووی عەمادیە پلەی دووەمی پێدراوە و چینەکەی بۆ موتەمایز بەرز بۆتەوە، لەسەر ئاماژەی دەوڵەت، بە رەزامەندی لە مێژووی ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٦ فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، بریار دراوە بە جێبەجێ کردنی، بە راگەیاندنی نووسراو بکرێت.



| | | |
|---|---|---|
| 8 شەوال 1318 (29 کانوونی دووەم 1901) | 001611.120821 | BEO |

نەزارەتی دارایی شکۆدار

ئەم نووسراوەی وێنەیەکی لە باڵادا تۆمار کراوە، راگەیەندراوە و جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا لە پەراوێز برەکەی دیاری کردووە، لە نەزارەتی دارایی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە شارۆچکەی عەمادیە بە مووچەی ۳۰۰ قوروش کاتیبی باج دەست بە کار دەبێت.



DH.MKT.02384.00006.001

| DH.MKT | 02384.00006 | 8 ڕەمەزان 1318 (30 کانوونی یەکەم 1900) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵی عالی
وەڵامی نووسراوی ٣٠ مایس ١٣١٦ ژمارە ٣٠ عالیە، لەبەر ئەوەی خشتەی داهاتی ئەیلوول لە کاتی خۆیدا نەناردراوە و دواخراوە، لە ئەرکەکەیان دوورخراونەتەوە و لە شوێن ئەوان کەسانی تر دادەمەزرێن، نووسراو کراوە فەرمانبەرانی ناسنامەی سلێمانی و عەمادیە عەزی بەگ و مەهدی ئەفەندی غەدریان لێکراوە، پشت بەستن بە ڕێنمایی یاسا ناردنی خشتەکان لە کات و مێژووی خۆیدا ڕەوان بکرێت، بۆ ئەوەی لەم بابەتە تێبگەن، بە ووتەی تۆماری ناسنامەی کارگێری گشتی ڕاگەیەندراوە و نووسراوی بۆ کراوە.




DH.TMIK.M.00108.00005.001

<table>
<tr><td>27 ڕەبیعی کۆتایی 1319 (13 ئۆغستۆس 1901)</td><td>00108.00005</td><td>DH.TMIK.M</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>تەلەگرافنامەی ویلایەتی موسڵە هاتووە<br>لە قائیمقامیەت ڕاگەیەندراوە ٣ قۆڵی عەشیرەتی تەیاری نیبەتی ئەوەیان هەیە هیرش بکەنە سەر قەزای عەمادیە، بە ڕیگەگرتن لە سەرپێچیەکانیان پێویستە دانیشتوانی گوندەکان بپاریزرێن، بۆ ئەمەش ئاگاداری دراوەتە قائیمقامیەتی ناوهاتوو و لایەنی سەربازی، هەروەها عەشیرەتی ناوهاتوو فرقەیەکی لە نەستوریەکانی دانیشتوی وان پێك دێن، بۆ ڕێگەگرتن لە سەرپێچیەکانیان نووسراو بۆ ویلایەتی وانیش کراوە، ڕاگەیەندراوە.<br>نازم</td></tr>
</table>




DH.TMIK.M.00110.00056.001

<table>
<tr><th>DH.TMIK.M</th><th>00110.00056</th><th>8 جەمادی یەکەم 1319 (23 ئۆغستۆس 1901)</th></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵی عالی<br>سەعید کوڕی عەبدوڵڵا پاشا قائیمقامی عەمادیە لەگەڵ هەندێك كەس زوڵم و زۆداریان ئەنجام داوە، دەستپێشخەریان کردووە لە دروست بوونی ناکۆکی و گەندەڵی نێوان عەشیرەتەکان، بە مۆری عەبدولعەزیز سەرۆکی عەشیرەتی جەیلانی داواکاری حەواڵەی پایەی سەدارەت کراوە، بە ووتەی قۆمیسیۆنی بەخێراکردنی مامەڵەکان هاوپێچ نێردراوە، بە لێکۆڵینەوە رابگەیەندرێت.</td></tr>
</table>




DH.TMIK.M.00115.00060.001

| DH.TMIK.M | 00115.00060 | 5 رەمەزان 1319 (16 کانوونی یەکەم 1901) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی مەکتوب
تەلەگرافنامەی ویلایەتی وان
بۆ پەرینەوە لە کوێستان بلۆکی نیزامیە هاوەڵی عەشیرەتی کۆچەری کردووە، کاتێك لە عەمادیە گەراونەتەوە لە ناحیەی تخوب لەگەڵ دانیشتوانەکەی رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە و هەردوولا چەکیان بەرامبەر یەکتر بە کار هێناوە، لە دانیشتوان ٣ کوژراو و لە سەربازەکان ٥ بریندار هەبووە، دوای ئەمە سەربازان ناچار بوونە چەك رادەست بکەن، سەعدی ئاغا بەرێوەبەری چاڵی و کورەکەی بە ناوی ئەولیا بەگ بە ٢٠٠ سیلاحشۆر گەیشتوونەتە سەر رووداوەکە، چەکەکانیان وەرگرتوتەوە، بلۆکیش گەیشتۆتە چۆلەمێرگ، ئەو ٣ تفەنگەی کە لە تخوب ماوەتەوە، فەرمانبەر رەوان کراوە تا وەربگیرێتەوە، لەسەر ئاماژەی خۆجێی راگەیەندراوە فەرمان.
تاهیر والی وان



DH.TMIK.M.00116.00065.002

| DH.TMIK.M | 00116.00065 | 26 ڕەمەزان 1319 (6 کانوونی دووەم 1902) |
| --- | --- | --- |
| لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>ماوەیەکە لە نێوان عەشیرەتی رایکان سەر بە قەزای عەمادیە و ئورمارلی سانجەقی هەکاری ناکۆکی و دووبەرەکی هەیە، بۆ کۆتایی هێنان بەم ناکۆکیانە لەلایەن شێخ بەهائەددین ئەفەندی کۆتایی پێ هێنراوە، لە ویلایەتی موسڵی سەروو تەلەگرافنامە هاتووە، بە ووتەی قۆمیسیۆنی بەخێراکردنی مامەڵەکان وێنەیەکی بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت نێردراوە، زانیاری دراوەتە نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار. | | |



DH.TMIK.M.00121.00006.001

| DH.TMIK.M | 00121.00006 | 16 زیلحیجة 1319 (26 مارت 1902) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە ١٢ مارت ١٣١٨ شیفرە، شێخی بامەرنی بەهائەددین ئەفەندی نێوانی عەشیرەتەکانی پاشکۆی سانجەقی رێکان و هەکاری ئاشت کردۆتەوە و لە مێژووی ٣ کانوونی یەکەم ١٣١٧ بە تەلەگراف راگەیەندراوە، لە بارەی ئاشت کردنەوەی نێوان کوردەکانی بەرواری و تەیاریە سریانیەکان ئەفەندی ناوهاتوو ئەرکی پێدرابوو، ئەگەرچی لە قەزاکانی زێبار و عەمادیە بۆ رۆژێکیش بێت بارودۆخ تێکنەچووە، بەلام لە قائیمقامیەت ئامۆژگاری نوێ دەرچووە، هەروەها شێخ سدیق ئەفەندی لە ویلایەتی وان بوونی هەیە، بە گفتوگۆ هاوکار بێت، راگەیەندراوە.
رەشید والی موسڵ




Y.PRK.ASK.00169.00017.001

<table dir="rtl">
<tr><td>Y.PRK.ASK</td><td>00169.00017</td><td>8 موحەررەم 1319 (27 نیسان 1901)</td></tr>
<tr><td colspan="3">پایەی سەرعەسکەر<br>قەڵەمی مەکتوب<br>تایبەتی<br>لـە نێـوان عەشـیرەتەکانی ویلایەتـی وان و عەشـیرەتەکانی قـەزای عەمادیـە ناکۆکـی دێریـن هەیـە، بۆیـە لـە دژی یەکـتر سـەرپێچی دەکـەن و بـێ لایـەن نەوەسـتاون، بـەم دواییـە هـەواڵ هاتـووە کـە هـەردوولا خۆیـان بـۆ ئەنجـام دانـی سـەرپێچی ئامـادە دەکـەن، لەسـەر ئـەم هەواڵـە قوماندانـی ژاندارمـەی ویلایـەت لەگـەڵ هێـزی ئامادەبـوو ڕۆیشـتوون، بـەم ڕاگەیەنـدراوە بـە داهاتـەوە ئـەم مەفـرەزە سـەربازیەی کـە لـە عەمادیـە هـاوکاری و یارمەتـی پێشـکەش کـردووە، لەسـەر ئامـاژەی ویلایەتـی موسـڵ پـرس بـە وەکالەتـی قوماندانیەتـی فرقـەی ١٢ کـراوە، مەفـرەزەی ناوهاتـوو هـاوکار دەبێـت و لـە وەڵامـدا نـووسراو بـۆ وەکالـەت و ویلایەتـی ناوهاتـوو کـراوە، تەلەگرافنامـە بـە نـاوی موشـیری لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن فەریـق کازم پاشـا هاتـووە و بـۆ چۆنیەتـی کارەکـەش بـە بابـی عالـی ڕاگەیەنـدراوە، بـۆ ڕاگەیاندنـی زانیـاری نـووسراو کـراوە، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئەفەندیمانـە.<br>ڕزا سەرعەسکەر</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>MF.MKT</td><td>00618.00022</td><td>21 زیلحیجه 1319 (31 مارت 1902)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بە واژووی بەڕێوەبەری مەعاریفی ویلایەتی موسڵ بۆ بەڕێوەبەری مەکتەبی ئیعدادیە<br>بە نووسراوی مێژووی ١٩ شوبات ١٣١٧ ژمارە ٤٥ ئەرکەکەی پەسەند کراوە، محەمەد تۆفیق ئەفەندی موعەلیمی مەکتەبی ئیبتیدائی قەزای عەمادیە هەڵبژێردراوە و دامەزراوە، مووچەکەی لە مێژووی دامەزراندنیەوە بە تەواوەتی پێی دەدرێت، لە سەر نووسراوی مێژووی ٢٦ کانوونی دووەم ١٣١٧ ژمارە ٧٣ وەڵام دراوەتەوە، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>




DH.MKT.02539.00075.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02539.00075</td><td>20 جەمادی کۆتایی 1319 (4 تشرینی یەکەم 1901)</td></tr>
<tr><td colspan="3">لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لەسەر سەرپێچی عەبدوڵلا پاشا قائیمقامی عەمادیە سکاڵا تۆمار کراوە، بە گوێرەی ئەم لێکۆڵینەوە بەرایيەی کراوە، پوختەی ئەوراقەکان لە یاریدەدەری داواکاری گشتی بەرز کراوەتەوە، لە بارەی بەرایيەکانی پێویستە دادگایی بکرێت، لە نووسراوی مێژووی 5 ئۆغستۆس ۱۳۱۷ ژمارە ٥٩ لەگەڵ هاوپێچ بەیەکەوە لە شورای دەوڵەت دراوەتە پەیوەندیداری سەدارەت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.02548.00062.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02548.00062</td><td>14 رەجەب 1319 (27 تشرینی یەکەم 1901)</td></tr>
<tr><td colspan="3">سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیەی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی ٢٥ ئەیلوول ١٣١٧ ژمارە ٦١ی عالیە، لەسەر هەندێک مەسەلە داوای لەسەر بەرز کراوەتەوە و لە قۆمیسیۆنی قەرزی گشتیش پرسیار کراوە حاڵی حازر لە کوێ نیشتەجێیە؟، عومەر لوتفی ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە، لە رۆژانی پێشوو لە موتەسەرفی سانجەقی غات دامەزراوە، ئەمرۆ لێرەیە، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>


DH.MKT.02549.00023.001

| DH.MKT | 02549.00023 | 16 رەجەب 1319 (29 تشرینی یەکەم 1901) |
|---|---|---|

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
لەسەر هەندێك بەڵگەی بڵاوکراوە لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە، ئەم لێکۆڵینەوەش بە گوێرەی ڕێنمایی یاسایی و دادپەروەرانە نەبووە، بۆیە داواکاری لەلایەن عەبدوڵلا پاشا قائیمقامی قەزای عەمادیە بەرز کراوەتەوە و داوای پاراستنی مافەکانی کردووە، تەلەگرافنامەکە بەرز کراوەتەوە، هەروەها ڕاگەیاندنی زانیاری ئەم بابەتە و خوێندنەوەی، بە نووسراوی مێژووی ١٠ ئەیلوول ١٣١٧ ژمارە ١٤٥ ی شورای دەوڵەتی شکۆدار نووسراوەتەوە، ناوبراو دەستگیر کراوە و ئەوراقی لێکۆڵینەوەی لە ویلایەتی موسڵ ڕەوان کراوە، لەگەڵ نووسراوی مێژووی ٢٠ ئەیلوول هەمان ساڵی بەندەمان دراوەتە پەیوەندیداری سەدارەت، تەلەگرافنامەی ناوهاتوو پێشکەش کراوە و بە سەرۆکایەتی ناوهاتووش ڕاگەیەندراوە.




DH.MKT.02596.00146.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02596.00146</td><td>29 زیلقەعدە 1319 (9 مارت 1902)</td></tr>
<tr><td colspan="3">لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لە شوێن خۆیدا ئەوراقی لێکۆڵینەوەی عەبدوڵڵا پاشا قائیمقامی عەمادیە رەوان کراوە و لە ٢٠ ئەیلوول ١٣١٧ بەرز کراوەتەوە، بۆ راپەراندنی کردنی کارەکە ئەمجارە نووسراوی مێژووی ٢٦ کانوونی دووەم ١٣١٧ ژمارە ١٤١ ی ویلایەتی موسڵ بۆ جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت بەرز کراوەتەوە، بە گوێرەی ئاماژەی پێشووی بەندە کارەکە جێبەجێ بکرێت، بریار و راگەیاندن بۆ رای سەروو دەگەڕێتەوە.</td></tr>
</table>




تلغراف نامه

داخلیه نظارت جلیلسنه

موصل والیسی

رشید



DH.TMIK.M.00124.00022.002

| DH.TMIK.M | 00124.00022 | 27 موحەررەم 1320 (6 مایس 1902) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

لە سایەی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بۆ رۆژێکیش بێت لە قەزای عەمادیە رووداو روونەداوە، بۆ ئەوەی عەشیرەتەکانی زێبار و هەرکی لە کاتی رۆیشتنیان بۆ کوێستان زیان بە گوندەکانی مەسیحی نەگەیەنن، ٣٠ نەفەر زەبتیە لەگەڵیان رۆیشتوون، لەبەر ئەوەی ئەمنیەت و ئاسایش بەرقەرار بووە، بەردەوام بریکاری بەتریق سوپاسگوزاری خۆی راگەیاندووە، لە مەرکەزی سمێل تەلەگراف رەوان کراوە، لەلایەن کێ و بە چ مەبەستێك رەوان کراوە لە خانەکەی بەتریقی ویلایەت لێکۆڵینەوە کراوە، زانیاری راگەیەندراوە.

رەشید والی موسڵ




MF.MKT.00674.00007.001

<table>
<tr><th>MF.MKT</th><th>00674.00007</th><th>8 شەعبان 1320 (10 تشرینی دووەم 1902)</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی مەعاریفی گشتی<br>ژمێریاری<br>ژمارە ٦٣٦٠<br>لە کارگێری مەعاریفی موسڵ خشتەی مانگی شوباتی ١٣١٧ هاتووە و ووردبینی بۆ کراوە، محەمەد تۆفیق ئەفەندی موعەلیمی مەکتەبی ئیبتیدائی عەمادیە سەنەدی مووچەی ١٢٠ قوروشی لایە، ٧ قوروش و ٨ پارە هاتۆتە خوارەوە، ئەگەرچی ١١٢ قوروش و ٣٢ پارە خەرجی تۆمار کراوە، بەڵام پێویستە ناوەرۆکی سەنەدەکە بە تەواوەتی تۆمار بکرێت، ئەم ٧ قوروش و ٨ پارەیەی کە بە دابەزین تۆمار کراوە، بە تۆمارکردنی خەرجی مانگانە بە رێککەوت لە خشتەی مانگانە تۆمار بکرێت، بە ئاماژەی بەرێوەبەرایەتی ئیعدادی موسڵ ئەم نووسراوە دراوەتە قەڵەمی مەکتوب.</td></tr>
</table>



| İ.ML | 00054.00068 | 22 سەفەر 1321 (20 مایس 1903) |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٥٤٥<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەسەر نووسراوی نەزارەتی دارایی شکۆدار کە حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، مەزبەتە لە فەرمانگەی دارایی رێکخراوە و هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، عەبدولرەحمان بەگ قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە لە خەرجی نۆژەنکردنەوەی قۆناغی حکوومەت و بۆ نان و پێداویستی تری زیندانیانی گرتووخانەکانی ناحیەی داودیە و قەزای ناوهاتوو لە مارتی ١٢٩٢ تا کۆتایی شوباتی ١٢٩٨ لە بودجە بێ بەرامبەر بووە، بێ مۆڵەت بری ١١،٤٨١ قوروش و ١٠ پارەی خەرج کردووە، ئەم برە پارەیە لە میراتی ناوبراوی مردوو وەربگیرێت، بەڵام برە پارەی ناوهاتوو نەچۆتە سەر ناوی ناوبراو، هەر چۆنێك بێت ناوبراو ئەم برە پارەیەی بۆ شان و شەوکەتی حکوومەت و بەخێوکردنی زیندانان خەرج کردووە، وەرگرتنەوەی ئەم پارەیە لە میرات لە شان و شەوکەتی عالی ناوەشێتەوە، بۆیە سرینەوە و هەڵوەشاندنەوەی حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.<br>سەدری ئەعزەم | | |



Y.A.RES.00125.00044.003

| | | |
|---|---|---|
| 12 جەمادی یەکەم 1321 (6 ئۆغستۆس 1903) | 00125.00044 | **Y.A.RES** |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ٢٨٢٨
لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
بەهۆی خزمەتە باشەکانی محەمەد شوکری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی عەمادیە داوای کردووە بە پلەی سێیەم پاداشت بکرێت، بۆیە لە مێژووی ٣٠ زیلقەعدە ١٣١٦ بە پلەی ناوبراو پاداشت کردنی داواکراوە، بۆ جێبەجێ کردنی جەنابی پاشا بفەرمووێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.

نازری کاروباری ناوەخۆ





DH.TMIK.M.00142.00062.002

<table>
<tr><td>DH.TMIK.M</td><td>00142.00062</td><td>13 موحەررەم 1321 (11 نیسان 1903)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>خراپەکاریەکانی بە تەلەگراف بە پایەی شکۆدار راگەیەندراوە، عەبدوڵڵا پاشا قائیمقامی عەمادیە هەندێك لە خزموکەسەکانی و شێخ سدیق ئەفەندی بۆ بارزان رەوان کردووە، چەند جارێك هەرەشەی کردووە و لە پێش چەندین شایەد ووتوویەتی، بەندەمان و سەربازانی تەمبێ دەکات، هەرچی ناوبراو لە زوڵمکەر و سەرپێچی کەرانە، بە تێروانین لە بابەتەکە روون دەبێتەوە رووداوێکی گەورە روودەدات و خەڵك دەست بە قسە دەکەن، تا گۆرینەوەی پێ نەکرێت، بۆ ئەوەی ئەمنیەتی گشتی تەواو بکرێت و تکای دادپەروەری پاشا و میهرەبانی شکۆدار دەکرێت، فەرمان.<br>تاهیر ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری و ٤ لە هاورێکانی</td></tr>
</table>



DH.TMIK.M.00159.00027.002

| DH.TMIK.M | 00159.00027 | 25 رەمەزان 1321 (15 کانوونی یەکەم 1903) |
|---|---|---|

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
ماوەی ٣ ساڵە لە نێوان عەشیرەتە چەکدارەکانی چاڵی قەزای چۆڵەمێرگ و ناحیەکانی بەرواری شەڕ بەردەوامە، دادگاکانیان بۆ ناحیەی چاڵ گوازراوەتەوە، بە گوێرەی زانیاری قائیمقامی چۆڵەمێرگ، نێوانی سەرۆکەکان سەعدی ئاغا و رەشید بەگ ئاشت کراوەتەوە، کەلوپەلە تاڵانکراوەکانیش رادەستی خاوەنەکانیان کراوەتەوە، لە موتەسەرەفی هەکاری ئاماژەی پێکراوە و تەلەگرافنامە لە ویلایەتی وان هاتووە و نووسراویش دراوەتە پەیوەندیداری سەدارەت، لە قۆمیسیۆنی بەخێرایی کردنی مامەڵەکان راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە.




DH.ŞFR.00305.00086.001

| DH.ŞFR | 00305.00086 | 29 موحەررەم 1321 (27 نیسان 1903) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>ئەمجارە موسیو مارکسکیز گەشتیاری ئینگلیز لە وانەوە بە ڕێگەی عەمادیە هاتووە، ڕاگەیەندراوە.<br>نوری والی موسڵ | | |




DH.MKT.00748.00033.003

| DH.MKT | 00748.00033 | 12 جەمادی یەکەم 1321 (6 ئۆغستۆس 1903) |
| --- | --- | --- |
| لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>بەهۆی خزمەتی پێشووی پلەی سێیەمی پێدراوە، هەروەها بۆ پاداشت کردنیشی محەمەد شوکری ئەفەندی داواکاری بەرز کردۆتەوە و داوای قائیمقامی عەمادیەی کردووە، ناوبراو لە مێژووی ٣٠ زیلقەعدە ١٣١٦ بە پلەی ناوبراو پاداشت کراوە، جێبەجێ کردنی بۆ جەنابی پایەبەرز ماوەتەوە. | | |



| İ.DH | 01411.000008 | 10 ڕەبیعی یەکەم 1321 (6 حوزەیران 1903) |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٧٤٨<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>بەهۆی کارە خراپەکانی عەبدوڵڵا پاشا قائیمقامی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ، دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو شوکری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی غدامس دابمەزرێت، لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە ڕێکخراوە لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت چی بێت جێبەجێ بکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم | | |

BEO.002098.157344.001

| BEO | 002098.157344 | 27 رەبیعی کۆتایی 1321 (23 تەمموز 1903) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
عەبدوڵلا پاشا قائیمقامی قەزای عەمادیە دوور خراوەتەوە، لە شوێن ئەو شوکری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی غودامی دابمەزرێت، لەسەر نووسراوی مێژووی ١١ سەفەر ١٣٢١ ژمارە ١١٥٦ ی دەوڵەت و بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە، لە مێژووی ٢٦ رەبیعی یەکەم ١٣٢١ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان دراوە، خۆشی لە نووسراوی قۆمیسیۆنی ناوهاتوو ئاگادار کراوەتەوە تا لە ئەرکەکەی دەست بە کار بێت، جێبەجێ بکرێت.


BEO.002198.164818.001

| BEO | 002198.164818 | 27 رەجەب 1321 (19 تشرینی یەکەم 1903) |
|---|---|---|

لایەنی والای سەر عەسکەرمان
لەمەر پاراستنی بناغەی ئاستی بەڕێوەبردنەکە تا کۆتایی ساڵ ٢٠٠٠ قوروش ماوە بدرێت، بۆ ئەم مەبەستەش یوزباشی محەمەد عەلی ئەفەندی ئەفسەری تابوری رەدیفی عەمادیە و مولازم خەتاب ئەفەندی بە بیانوی داواکردنی پارە بە چەکەوە هێرشیان کردۆتە سەر ئەسعەد بەڕێوەبەری دارایی و لە دوو شوێن برینداریان کردووە، بە واژووی ناوبراو تەلەگرافنامە هاتووە، بە راگەیاندن و داواکردنی پارەکە، بەپەلە لێکۆڵینەوە بکرێت، بە گوێرەی دروستی بارودۆخەکە ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.

BEO.002248.168584.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>002248.168584</td><td>18 شەوال 1321 (7 کانوونی دووەم 1904)</td></tr>
<tr><td colspan="3">تەلەگراف بۆ ویلایەتی وان<br>شێخی شەمدینان شێخ سدیق لە ناحیەکانی نیروە و رەبتانی قەزای عەمادیە دەستپێشخەری کردووە بۆ وەرگرتنی دە یەك، خەڵکی ناوەخۆش سکاڵایان لەم بارەیەوە هەیە، ئەوەی شایەنی وتنە لە لێکۆڵینەوەکان روون بۆتەوە ناوبراو هیچ مولکێك و وەقفێکی لە ناو ویلایەتی موسڵ نییە، لە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە ئەم جۆرە سەرپێچیانە و جموجۆڵانە بە هیچ شێوەیەك جێگەی قەبوڵ نییە، ئەگەر زوڵمی لێکراوە دەتوانێت سەردانی فەرمانگەکانی دادگای نیزامی بکات، ئاماژەی پێ بکرێت.</td></tr>
</table>



| BEO | 002384.178765 | 21 جەمادی یەکەم 1321 (15 ئۆغستۆس 1903) |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>ئەم نووسراوەی وێنەیەکی لە بالادا تۆمار کراوە راگەیەندراوە و فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە پەراوێز برەکەی دیاری کراوە، لە نەزارەتی دارایی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.<br><br>لە قەزای عەمادیە مورەتتەباتە نوێیەکانی (ژمارەی سەربازانی زەبتیە یا داهات) ناحیەی وادیەی سەر بە قەزای عەمادیە تۆماری تەواو بووە، لە ١٣٢٠ ەوە نووسراو کراوە بۆ وەرگرتنی. | | |




İ.ML.00059.00039.004

| İ.ML | 00059.00039 | 26 رەبیعی کۆتایی 1322 (10 تەمموز 1904) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١١٧٩

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

لەسەر ئەم راپۆرتەی لە نەزارەتی دارایی شکۆدار حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لە فەرمانگەی دارایی مەزبەتە رێکخراوە دواتر لەگەڵ هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، تاحیەی داودیە سەر بە قەزای عەمادیەی سانجەقی موسڵ باجی مولك و تەمەتتوعات و پیشەگەری رێکخراوە لەگەڵ پارەی داهاتی مەعاریف و رێکخستنی پێداویستی سەربازی و شوێنگرەوەی سەربازی ژمارەی ناسنامەی نێری ناموسڵمانەکان ١٢١،٣١٧ قوروش و ١٣ پارە، هەروەها بەهای مولك و زەوی و زار لە هەزار یەك و تەمەتتوعاتی پیشەگەری لە سەدا نیوەی هەژمار بکرێت و بە یەکجاری دابین بکرێت، بریار لەسەر بردنی دراوە و خەرجی تۆمارکردنی ٢٤،٨٢٢٢ قوروش و ١٣ پارە پێك هاتووە، ئەم خەرجیەی کە ناوی هاتووە لەگەڵ تۆمار کردنی هەژماری رێکخستنی داهاتی مەعاریف و ئامادەکاری سەربازی یەك بە یەك هەژمار کراوە، خەرجی نوێی ناوهاتوو لە مێژووی ١٣٢٠ داهاتەکە وەردەگیرێت، بۆ ئە مەبەستەش حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.

سەدری ئەعزەم



Y__A___RES_00126.00077.001

| 18 رەبیعی کۆتایی 1322 (2 تەمموز 1904) | 00126.00077 | Y.A.RES |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٠٩٥
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی موسڵ لە رووی جوگرافیەوە گرنگە، شوکری ئەفەندی قائیمقامی قەزای ناوبراویش پیر و بێتوانایە، بۆیە مانەوەی گونجاو نییە، لە شوێنێك دادەمەزرێت کە بۆ ئەو گونجاو بێت، لە شوێن ئەویش ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی لێبووردراو لە زغفرانبولی دادەمەزرێت، نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار و مەزبەتەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە کە دراوەتە قەڵەم و وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم




تلغراف نامه



DH.TMIK.M.00183.00053.004

| 16 شەعبان 1322 (26 تشرینی یەکەم 1904) | 00183.00053 | **DH.TMIK.M** |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

لە ٢٧ ئەیلوول ١٣٢٠ لەلایەن سوڵتان و هاوەڵانی تەلەگراف لە شەمدینان دەرچووە و کۆپیەیەکیشی هێنراوە و خوێندنەوەی بۆ کراوە، شێخ محەمەد بارزانی بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە هەندێك عەشیرەتی ئەم ناوچەیە، دەچێتە شەمدینان و ناحیەکانی نیروە و دەریکنار دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی کۆمەڵە، بۆ هێور کردنەوەی بارودۆخەکە مەفرەزە بروات، تا نێوانیان ئاشت بکاتەوە و کۆمەڵەکە پەرشوبلاو بکاتەوە، ئەم هەواڵەش لەلایەن تۆفیق بەگ بینباشی ژاندارمەی عەمادیە زانراوە، فەرمان.

نوری والی موسڵ



DH.TMIK.M.00184.00048.001



DH.TMIK.M.00184.00048.004

<table>
<tr><th>DH.TMIK.M</th><th>00184.00048</th><th>24 ڕەجەب 1322 (4 تشرینی یەکەم 1904)</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>عەشیرەتی بارزانی سەر بە موسڵ لە مەفرەزەی شەمدینان تفەنگیان بردووە و کشاونەتەوە، بۆ وەرگرتنەوە و ڕادەست کردنەوەی تفەنگەکان و تەمبێ کردنی بوێری کەران، لە ویلایەتی موسڵ هێزی سەربازی ڕەوان کراوە، بەڵام ئەم هێزە تەنیا تفەنگەکانیان وەرگرتووە و لە بارەی تەمبێ کردنی بوێری کەران هیچ شتێکیان نەکردووە، بەمەش هەندێکیان بوێریان زیاد بووە، دووبارە هاتوونەتە سنووری ناحیەی گەردی شەمدینان هەرەشەیان لە دانیشتوان کردووە، ئەم زانیارییە لە موتەسەرفی هەکاری ڕاگەیەندراوە و بۆ چارەسەری کارەکە ڕاگەیەندراوە، فەرمان.<br>تاهیر والی وان</td></tr>
</table>

<table>
<tr><th>DH.TMIK.M</th><th>00184.00048</th><th>23 ڕەمەزان 1322 (1 کانوونی یەکەم 1904)</th></tr>
<tr><td colspan="3">شیفرە بۆ ویلایەتی وانی سەروو<br>لە بارەی ڕێگەگرتن لە سەرپێچی عەشیرەتەکان ئامادەکاری پێویست بەردەوامە، بەڵام تا ڕێگە لە جولە و گەندەڵیەکانی شێخ سدیق ئەفەندی نەگیرێت، سەقامگیری ئاسایشی قەزاکانی زێبار و عەمادیە سەرکەوتوو نابێت و ڕووداوەکان کەم نابێت، وەڵام لە ویلایەتی موسڵ هاتووە و بە ووتەی قۆمیسیۆن نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>



Y.MTV.00261.00186.001

<table>
<tr><th>Y.MTV</th><th>00261.00186</th><th>29 ڕەبیعی کۆتایی 1322 (13 تەمموز 1904)</th></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کیتابەت<br>لە عەمادیەوە شیفرە<br>لە سایەی جەنابی پاشا ئامادەکاری کراوە، لە نێوان عەشیرەتەکانی عەمادیە ناکۆکی و ڕووبەڕووبوونەوە و گرژی یەکلاییکراوەتەوە، پشت بەستن بە خوی عەشیرەتگەری بۆ سوودی خەزینە بابەتەکان چاك بکرێنەوە، بەڵام پێویستە لە نێوان عەشیرەتەکانی مونتەفیق چاکسازی بکرێت، بەڵام ئاستی لێهاتوو و ژمارەی هێزی سەربازی لیوای ناوهاتوو تەواو نییە، بۆیە هیچ شتێك ناکرێت، بە وەکالەتی موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو و قوماندان ئاماژەی هاوبەش ڕوون بۆتەوە، پێویستە هێزێکی تەواو لەگەڵ بەندەمان بچێتە ئەوێ، هەر چەندە عالی ڕەزامەندی نیشان داوە، بە ئاماژەی لەشکری هومایۆنیش بە پێویستی زانیوە، بۆیە لە بەغداد بە قوماندانیەتی بینباشی ئەحمەد ئاغا مەفرەزەی هاتووە و تۆپی بیابانیش لە عەمادیە بەجێ هێڵدراوە، بە قوماندانیەتی بینباشی ئەمین یەمنی ئەفەندی لە ئالای ٤١دا تابوری یەکەم لە مونتەفیك و مەفرەزەی بەسراش بەیەکەوە، لەگەڵ ٢ تۆپی چیا هێنراوە، بۆ هاوکاری بەندەمان ڕاگەیەندراوە فەرمان.<br>فەریق مستەفا نوری والی و قوماندای بەسرا</td></tr>
</table>



DH.ŞFR.00328.00028.001

| DH.ŞFR | 00328.00028 | 2 ڕەبیعی یەکەم 1322 (17 مایس 1904) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە ٢٧ نیسان ١٣٢٠ بە تەلەگرافنامەی بەندەمان ڕاگەیەندراوە، میستەر ویوودریم ئینگلیزی هاتووتە موسڵ و دەگەڕێتەوە وان، هەر دوێنێ لە ڕێگای عەمادیە لە موسڵ جولەی کردووە، ڕاگەیەندراوە فەرمان.<br>والی موسڵ نوری | | |




تلغراف نامه

داخلیه نظارت جلیله سنه

موصل والیسی
نوری



DH.ŞFR.00338.00028.001

| 6 زیلقەعدە 1322 (12 کانوونی دووەم 1905) | 00338.00028 | DH.ŞFR |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە مێژووی ٢٥ کانوونی یەکەم ١٣٢٠ بە تەلەگرافنامە راگەیەندراوە، هاووڵاتی ئەمەریکی مقداویل بە رێگەی عەمادیە گەراوەتەوە وان، فەرمان.<br>نوری والی موسڵ | | |





| 4 شەوال 1322 (12 کانوونی یەکەم 1904) | 00860.00063 | DH.MKT |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵی سەروو<br>ئەحمەد ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیە دامەزراوە، هەر کە گەیشتە سەر ئەرکەکەی و دەستی بە کار کرد لە مێژووی دەست بەکار بوونی مانگانە ٢٢٥٠ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت و لە شوێن خۆشیدا جێبەجێ دەکرێت، جگە لەمە مانگانە نیوەی مووچەکەی بە گوێرەی نیزام دەبێت و مێژووی دەست لەکار هەڵگرتنی قائیمقامی پێشووش رادەگەیەندرێت، لە سەدا ٦ جگە لە خەرجی رێگا کە ٣٣١٩ قوروشە لە موازەنەی ناوەخۆ رێك دەخرێت، ئەمەش لە خشتەی خەرجی تۆمار کراوە، بەراگەیاندنی نووسراو کراوە. | | |

| 14 رەجەب 1322 (24 ئەیلوول 1904) | 00860.00063 | DH.MKT |
|---|---|---|
| جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لە دەرچووانی مەکتەبی مولکیەی شاهانە ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی پێشووی زەغفرانبولی لە قائیمقامیەتی قەزای عەمارە دامەزرێت، لەگەڵ نووسراوی ٣٠ مایس ١٣٢٠ راگەیەندراوە و کۆتایی پێ هاتووە، بە مەزبەتەی رێکخراو لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە هەڵبژاردنی پەسەند کراوە و پێشکەشی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە، هێشتا فەرمانی پاشای جەنابی پاشا دەرچووە، ئەمجارە لە ویلایەتی موسڵ دووبارە ئاماژەی پێکراوە، بۆ دووپاتکردنەوە نووسراو کراوە. | | |





| 16 جەمادی یەکەم 1322 (29 تەمموز 1904) | 00860.00065 | DH.MKT |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە ٢٩ نیسان ١٣٢٠ فەرمان دەرچووە، کۆپیەیەکی بردراوە و خوێندنەوەی بۆ کراوە، بەهۆی باران و رەشەبای زۆرەوە بە شێوەیەکی گشتی سێیەکی کشتوکاڵەکەیان دووچاری زەرەر بووە، لە قائیمقامیەتی عەمادیە راگەیەندراوە، دانیشتوانی گوند لە بانقی زراعەت قەرزی ئاقچە و لەلایەن کۆمەڵگاوە هاوکاری بکرێن، بۆ دڵنیاکردنەوەی پێداویستیەکانیان ئاگاداری دراوە، بەڵام دانیشتوانی ناوبراو داوای میهرەبانی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەتیان کردووە، بەم تێروانینە بە ووتەی ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت جێبەجێ کردنی راگەیەندراوە.
نوری والی موسڵ

| 28 رەبیعی یەکەم 1322 (12 حوزەیران 1904) | 00860.00065 | DH.MKT |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵی سەروو
بەهۆی رەشەبا و بارانی زۆرەوە کشتوکاڵی گوندەکانی قەزای عەمادیە تووشی زیان بوون، بۆ ئەم مەبەستە وەکو هاوکاری بانقی زراعەت قەرزی ئاقچەی داوەتە دانیشتوانی گوندەکان، بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانیان لە خۆجێی ئاگاداری بەرز کراوەتەوە، دانیشتوانی ناوهاتووش داواکاریان داوەتە پاشا، لەگەڵ راگەیاندنی جێبەجێ بکرێت، تەلەگرافنامەی مێژووی ١٦ مایس ١٣٢٠ خوێندنەوەی بۆ کراوە، ئەم زیانەی لە شار روویداوە، ناتوانرێت لە مەرکەز چارەسەر بکرێت، هەر خۆی دانیشتوانی ناوهاتوو تکایان کردووە و هیممەت بکرێت لە چارەسەر کردنی کێشەکە.



DH.MKT.00915.00066.001

| | | |
|---|---|---|
| 10 شەوال 1322 (18 کانوونی یەکەم 1904) | 00915.00066 | **DH.MKT** |

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
لەلایەن چەلەبی زادە محەمەد تاهیر ئەفەندی دانیشتوی گوندی مالی سەر بە قەزای عەمادیەی ویلایەتی موسڵ و لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، بۆ لە دایك بوونی هومایۆن و جەنابی پاشا شیعرێکی بە زمانی عەرەبی نووسیوە و لەگەڵ داواکاری پێشکەشی کردووە، بۆ ئەم مەبەستە شایەنی میهرەبانیە و مووچەیەکی گونجاوی بۆ ببرێتەوە، لە ویلایەتی دیاربەکری سەروو نووسراوی مێژووی ٢٦ تشرینی دووەم ١٣٢٠ ژمارە ١٠٢ پێشکەش کراوە، هاوکاری سەرووی پێویستە.



| 21 ڕەجەب 1322 (1 تشرینی یەکەم 1904) | 01427.000036 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٠١٠
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەبەر گرنگی شوێنی جوگرافی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی موسڵ، مانەوەی شوکری ئەفەندی قائیمقامی قەزای ناوهاتوو لە ئەرکەکەی گونجاو نییە، چونکە پیر و توانای نەماوە، بۆیە لە شوێنێك دابمەزرێت لەگەڵ بارودۆخی جەستەیی بگونجێت، لە شوێن ئەویش ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی بورداوی زعفرانبولی دابمەزرێت، نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار و مەزبەتەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دراوەتە قەڵەم لەگەڵ وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی بەیەکەوە لە مێژووی ١٨ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٢ بە نووسراو ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ دووپاتکردنەوە ئەمجارە نووسراو لە نەزارەتی ناوهاتوو ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە ڕاگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم



BEO.002432.182381.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>002432.182381</td><td>9 شەعبان 1322 (19 تشرینی یەکەم 1904)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>دوای دوورخستنەوەی شوکری ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە، لە شوێنێکی گونجاو و لە شوێن ئەویش ئەحمەد ئەفەندی بوردراو لە قائیمقامی زەعفرانبولی دابمەزرێت، بۆ ئەمەش لەسەر نووسراوی ١٤ رەجەب ١٣٢٢ ژمارە ٣٢٤٢، لە مێژووی ٧ شەعبان ١٣٢٢ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



| | | |
|---|---|---|
| 12 شەوال 1322 (20 کانوونی یەکەم 1904) | 002467.184951 | BEO |

نەزارەتی دارایی شکۆدار
برێکی گونجاو مووچە بۆ چەبەلی زادە محەمەد تاهیر ئەفەندی لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی و دانیشتووی قەزای عەمادیە دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لە ویلایەتی دیاربەکری پایەبەرز نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، هاوپێچ لەگەڵ نووسراوی مێژووی ١٠ شەوال ١٣٢٢ ژمارە ٤٢٨٦ی نەزارەتی ناوهاتوو بەیەکەوە بۆ دەوڵەت بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




BEO.002499.187423.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>002499.187423</td><td>27 زیلقەعدە 1322 (2 شوبات 1905)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>ئـەم نـووسراوەی وێنەیەکـی لـە بـاڵادا تۆمارکـراوە، راگەیەنـدراوە و لە پەراوێـزی فەرمانـی پاشای پەیوەندیداری خەلافـەت برەکـەی دیـاری کـراوە، لـە نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.<br><br>دوو کاتیبـی بـاج لـە ناحیەکانـی داودیـە و بـەرواری ژێـری سـەر بـە قـەزای عەمادیـە دامـەزراوە و مووچەکانیـان دیـاری کـراوە.</td></tr>
</table>



DH.ŞFR.00359.00038.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR</td><td>00359.00038</td><td>23 زیلقەعدە 1323 (19 کانوونی دووەم 1906)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە مێژووی ٢٠ کانوونی دووەم ١٣٢١ فەرمان بە تەلەگراف دەرچووە و کۆپیەیەکی خویندنەوەی بۆ کراوە، لەسەر ئەم سکالایانەی لە بارەی ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی عەمادیە بەرز کراوەتەوە، لێکۆڵینەوە کراوە و ئەوراقەکان بە پۆستە پێشکەش کراوە، بەڵام لەسەر تەلەگرافی ١٢ کانوونی یەکەم ١٣٢١ راگەیەندراوە، تا مامەڵەکە جێبەجێ دەبێت، بە باش نەزانراوە ناوبراو لە قەزای ناوهاتوو ئەرکەکەی جیبەجێ بکات، بۆیە بەپەلە چارەسەر بکرێت و راگەیەندراوە، فەرمان.<br>مستەفا والی موسڵ</td></tr>
</table>





| 18 زیلقەعدە 1323 (14 کانوونی دووەم 1906) | 01018.00063 | DH.MKT |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵی عالی<br>وەڵامی نووسراوی ١٤ تشرینی دووەم ١٣٢١ ژمارە ٩٢ی عالیە، خەرجی نۆژەنکردنەوەی قۆناغی حکوومەتی قەزای عەمادیە لەلایەن شوکری ئەفەندی قائیمقامی پێشوو دابین کراوە، بەڵام تۆمار نەکراوە و بری ٩٨٥ قوروش بە هەڵواسراوی ماوەتەوە، لەگەڵ هەژماری موازەنەی ١٣٢٠ ویلایەتی عالی بەراورد کراوە، دابین کردنی بە گونجاو نەزانراوە، بەم راگەیەندراوە حەواڵەنامە رەوان کراوە، کەچی ماوەی هەژمارەکە جێبەجێ کراوە و لە خەزینەی شکۆداریش حەواڵەنامە نەدراوە، هەر چۆنێك بێت لە موازەنەی ١٣٢١ تۆمار بکرێت و هەژمار بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری نوسراو کراوە. | | |

| 22 شەعبان 1323 (22 تشرینی یەکەم 1905) | 01018.00063 | DH.MKT |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵی عالی<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٢ ئۆغستۆس ١٣٢١ ژمارە ٥٥ ی پایەی عالیە، بۆ نۆژەنکردنەوەی قۆناغی حکوومەتی قەزای عەمادیە ٩٨٥ قوروش خەرج کراوە، لە موازەنەی ساڵی ١٣٢٠ یش تۆمار کراوە، بەڵام بۆ تێچووی نۆژەنکردنەوە، خەرجی هەژمار نەکراوە و بە کراوەیی ماوەتەوە، هەروەها رێکخستنی ناوهاتوو بە تەواوەتی خەرج کراوە، بۆ برە پارەی ناوهاتووش بە حەواڵەنامە ئاماژەی پێکراوە، بەڵام ماوەی هەژمارەکە بەسەرچووە، بۆیە لە خەزینەی شکۆدار حەواڵەنامە رەوان نەکراوە، ٩٨٥ قوروش لە موازەنەی ویلایەت تۆمار بکرێت و جێبەجێ بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری نووسراو بۆ راگەیاندنی کراوە. | | |



| | | |
|---|---|---|
| 22 سەفەر 1323 (28 نیسان 1905) | 002562.192128 | **BEO** |

نەزارەتی دارایی شکۆدار

ئەم نووسراوەی راگەیەندراوە وێنەیەکی لە باڵادا تۆمار کراوە، برەکەی لە پەراوێزی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت ئاماژەی پێکراوە، لە نەزارەتی دارایی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

لە بارەی گشت ئەملاك و تەمەتتوعاتی باج و رێکخستنی کەرستەی سەربازی و داهاتی مەعاریف و شوێنگرەوەی ناموسڵمانانی ناحیەی بەرواری سەر بە قەزای عەمادیەی سانجەقی موسڵ.



| | | |
|---|---|---|
| 6 شەوال 1323 (4 کانوونی یەکەم 1905) | 002715.203618 | BEO |

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
ئەم نووسراوەی وێنەیەکی لە بالادا تۆمارکراوە، راگەیەندراوە و برەکەی لە پەراوێزی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دیاریکراوە. لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

عەبدوڵڵا پاشا قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە و ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری قەزا دادگایی کراون.



| 18 شەوال 1323 (16 کانوونی یەکەم 1905) | 002723.204187 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
قائیمقامی عەمادیە لە بەڕێوەبردنی ئیدارە شوێنەواری خراپی جێ هێشتووە، بەهۆیەوە ناکۆکی لە نێوان نەستوری و ئیسلامەکان دروست بووە، نەستوریەکان گوندەکانی بەرواری باڵای ئیسلامیان داگیر کردووە، ئەمەش لەلایەن ئیسلامیەکانەوە جێگای قەبوڵ نییە و کۆمەڵ کۆمەڵ کۆدەبنەوە، لەلایەن تاهیر و ٣ لە هاوەڵانی تەلەگرافنامە لە مێژووی ١ کانوونی یەکەم ١٣٢١ بۆ دەوڵەت ڕەوان کراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئاماژەکە، بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و هاوپێچەکان ڕەوان بکرێتەوە.




BEO.002743.205665.003

| BEO | 002743.205665 | 16 شەوال 1323 (14 کانوونی یەکەم 1905) |
|---|---|---|
| پایەی سەدارەتی پیرۆز<br>قائیمقامی عەمادیە هۆکار بووە لە دروست بوونی ناکۆکی نێوان عەشیرەتە کوردییەکان، پروشکی ئەم ئاگرەش پەریوەتەوە بۆ هەکاری و بۆتە هۆکاری دروست بوونی ناکۆکی لە نێوان تەیاری نەستوری و ئیسلامەکان، هەستاون بە دەستگرتن بەسەر گوندەکانی بەرواری باڵای ئیسلامەکان و ئەندامانی خێزانی ئیسلامی بە دیل گیراون، ئیسلامەکانیش فەوج فەوج کۆدەبنەوە، بەهۆی ئەم نائیدارییەی قائیمقام حکوومەت شکستی هێناوە. | | |




DH.SN.M..00140.00084.001

<table>
<tr><td>DH.SN.M</td><td>00140.00084</td><td>29 سەفەر 1324 (24 نیسان 1906)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>....................<br>ژمارە ١<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار/بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی تۆماری ناسنامەی عالی<br>لە بارەی کەموکوری مامەڵەی هەشت یەکی جێبەجێ کردنی ناسنامە، بریارنامەی مێژووی ١١ مارت ١٣٢٢ ژمارە ٦٢ هاتووە، ئەمجارە بە دووپاتکردنەوە ئاماژە دراوەتە فەرمانبەرانی ناسنامەی کەرکووك و عەمادیە، هەروەها لە بەرامبەر دواکەوتنی ناردنی برە پارەی دیاریکراو، هۆکارەکان کۆتایی پێ بهێنرێت، هەرچی زووە کارەکە رابگەیەندرێت و پێشکەش بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.<br>مۆری باش کاتیب بریکاری باش ناسنامەی ویلایەتی موسڵ</td></tr>
</table>


DH.MKT.01041.00057.010



DH.MKT.01041.00057.011

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT</td><td>01041.00057</td><td>7 سەفەر 1324 (2 نیسان 1906)</td></tr>
<tr><td colspan="3">لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لەبارەی ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە، ئەم ئەوراقانەی لە ویلایەتی موسڵ رەوان کراوە، لە شورای دەوڵەت ووردبینی بۆ دەکرێت، سەرەتا هاوپێچ پێشکەشی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە.</td></tr>
</table>

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT</td><td>01041.00057</td><td>7 سەفەر 1324 (2 نیسان 1906)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>٢٩٤<br>لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>لە بارەی ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە لێکۆڵینەوە کراوە، ئەم وەرەقانەی لە ویلایەتی موسڵ رەوان کراوە، لە شورای دەوڵەت سەرقاڵی ووردبینی کردنن، هاوپێچ بۆ سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>




| | | |
|---|---|---|
| **1 سەفەر 1324 (27 مارت 1906)** | 01041.00057 | **DH.MKT** |

لە بارەی ئەحمەد تۆفیق قائیمقامی عەمادیە لێکۆڵینەوە کراوە و دوای خوێندنەوەی ئەوراقی لێکۆڵینەوە، لە قۆمیسیۆن راگەیەندراوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی لە سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیەی شکۆدار بە نووسراوی ٨ مارت ١٣٢٢ ژمارە ٧ ئاماژەی پێکراوە، ئەوراقی لێکۆڵینەوەی ناوهاتووش لە شورای دەوڵەت ووردبینی بۆ دەکرێت و هاوپێچ رەوان دەکرێتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.
مۆری بەرێوەبەری قەڵەمی فەرمانبەران

| | | |
|---|---|---|
| **17 موحەررەم 1324 (13 مارت 1906)** | 01041.00057 | **DH.MKT** |

سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیەی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٤ شوبات ١٣٢١ ژمارە ٤٢، لە بارەی ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی عەمادیە لێکۆڵینەوە کراوە، ئەم ئەوراقانەی داواکراوە لە ویلایەتی موسڵ لەگەڵ نووسراوی مێژووی ٢١ کانوونی دووەم ١٣٢١ ژمارە ١٠٨ رەوان کراوە، دوای ئەوەی لە قۆمیسیون خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، رەوانی شورای دەوڵەت دەکرێت.

DH.MKT.01087.00089.001

<table dir="rtl">
<tr><th>DH.MKT</th><th>01087.00089</th><th>16 ڕەبیعی کۆتایی 1324 (9 حوزەیران 1906)</th></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵی پایەبەرز<br>لە سەردەمی والی پێشوو لەسەر ووتەی هەندێك كەس هێنراوەتە موسڵ و دەستبەسەر كراوە، لەبەر ئەوەی غەدری لێكراوە، داواكراوە تا لێكۆڵینەوەكەی كۆتایی دێت، بە كەفالەتێكی زۆر ئازاد بكرێت، بە واژووی عەبدولعەزیز خانەدانی عەمادیە تەلەگرافنامە لە موسڵ دەرچووە، بە تێروانین لە بەراییەكانی لێكۆڵینەوە بكرێت و هیممەت بكرێت.</td></tr>
</table>


DH.MKT.01148.00016.001

| DH.MKT | 001148.00016 | 24 زیلحیجە 1324 (8 شوبات 1907) |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
١١٣
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ووردبینی لە هۆکاری جیابوونەوەی لە ئەرکەکەی کراوە و دووبارە بەکارهێنانەوەی خراوەتە ژێر بریارەوە، بۆیە داواکاری بە واژووی محەمەد شوکری قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە دراوەتە شورای دەوڵەت، هەروەها هاوپێچەکانی بە بریاری فەرمانگەی مولکیە نێردراوە، لەم بابەتەدا زانیاری و خوێندنەوەی عالی ئاماژەی پێکراوە لەگەڵ هاوپێچ ڕەوان کراوەتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.
سەرۆکی شورای دەوڵەت



BEO.002935.220079.001

| 7 رەمەزان 1324 (25 تشرینی یەکەم 1906) | 002935.220079 | BEO |
|---|---|---|

شیفرە بۆ ویلایەتی موسڵ
بۆ دەستگیرکردنی سەرپێچی کارانی عەمادیە و رێگەگرتن لە کارە سەرپێچیەکانی عەبدوللەتیف و هاوەڵانی، وەکو هێزی پاڵپشت مەفرەزەیەکی ژاندارمە رەوان بکرێت، وەڵامی قوماندانیەتی موسڵ بە لایەنی سەر عەسکەر راگەیەندراوە.



| BEO | 002975.223093 | 16 زیلقەعدە 1324 (1 کانوونی دووەم 1907) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وێنەیەکی مەزبەتەی شورای دەوڵەت لە باڵا تۆمار کراوە، نووسراوی راگەیەندراو و بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت برەکەی لە پەراوێز نووسراوەتەوە، جگە لەمە ئەوراقی لێکۆڵینەوە رەوان بکرێتەوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدارش هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی قائیمقامی عەمادیە و ئەوانی تر دراونەتە دادگا.



| 19 زیلحیجە 1324 (3 شوبات 1907) | 002988.224065 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی ١٧ زیلحیجە ١٣٢٤ ژمارە ٤٣٩٥ ی دەوڵەتە، لێکۆڵینەوە لە هەندێك بابەتی گرنگ کراوە، جگە لەمە قائیمقامیەت بە وەکالەت بەڕێوەدەبردرێت، بەهائەددین ئەفەندی قەڵەمی مومەیزی مەکتوبی ویلایەتی موسڵ ڕەوانی عەمادیە کراوە، بە ئاماژەی ویلایەت سێ یەکی بۆ هەژمار دەکرێت و دابین کردنی مووچەی وەکالەتەکەی بە گونجاو زانراوە، نووسراو کراوە.



| 11 شەعبان 1325 (19 ئەیلوول 1907) | 00029.00030 | DH.MTV |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ شکۆدار
لە سەرەتای ئەیلوولی ١٣٢٦ تا کۆتایی تشرینی دووەم هۆبەی کۆمەڵەی هاوکاری میللی دۆننمای عوسمانی قەزای عەمادیە هاوکار بووە و یارمەتی دابین کردووە، ٢٥٢٩ قوروش بۆ سندوقی دارایی خۆجێی رەوان کراوە، بەڵام لە سندوقی ناوهاتوو لەگەڵ ئەمانەت ٥٠٠٠٠ قوروش بوونی هەبووە و دزراوە، بۆیە چاودێری یاسایی لە بارەی بەڕێوەبەری دارایی و ئەمینی سندوق دەکرێت، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە هاوکاری ئاقچەی ناوهاتوو چۆتە سەر ناوی زەینەل ئەفەندی ئەمینی سندوق، بۆ بەدەست هێنانی لە مەرکەزی گشتی کۆمەڵەی ناوهاتووی داواکراوە، برە پارەی ناوهاتوو لە زەینەل ئەفەندی وەربگیرێتەوە، بە وەرگرتنی ئەنجامەکەشی ئاماژەی پێ بکرێت.



Y.A.RES.00149.00087.001

<table>
<tr><th>Y.A.RES</th><th>00149.00087</th><th>9 شەعبان 1325 (17 ئەیلوول 1907)</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٢٦٠٤<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>پشت بەستن بە بریارنامەی تایبەتی، محەمەد شوکری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە بری ١١٢٥ قوروش مووچەی دابراوانی بۆ دابین دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستە مەزبەتەی فەرمانگەی رێکخستنی شورای دەوڵەت راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بەم راگەیەندراوە نووسراو کراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



Y.A.RES.00152.00056.001

| Y.A.RES | 00152.00056 | 3 زیلحیجە 1325 (7 کانوونی دووەم 1908) |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٣٨٥٥
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
پشت بەستن بە بریارنامەی تایبەتی کۆڵەکەی یاسا، محەمەد شوکری ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە ١١٢٥ قوروش مووچەی دابراوانی بۆ دابین بکرێت، لەم بارەیەوە مەزبەتەی فەرمانگەی رێکخستنی شورای دەوڵەت بە نووسراوی ٩ شەعبان ١٣٢٥ بە جەنابی عالی راگەیەندراوە، لەلایەن ناوبراوەوە بەدواداچوون و تکا کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم




DH.TMIK.M.00248.00037.002

| 20 جەمادی یەکەم 1325 (1 تەمموز 1907) | 00248.00037 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵی عالی<br>عەبدوڵلا بە ناوی دانیشتوانی قەزای عەمادیە و بە واژووی خۆی لە مەرکەزی سمێل تەلەگرافنامەیەکی لە مێژووی ٧ حوزەیران ١٣٢٣ رەوان کردووە، کۆپیەیەکی هێنراوە و خوێندنەوەی بۆ بکرێت، بە ووتەی قۆمیسیۆن راگەیەندراوە، کارەکە جێبەجێ بکرێت. | | |




تلغراف نامه



DH.ŞFR.00383.00003.001

| DH.ŞFR | 00383.00003 | 15 جەمادی یەکەم 1325 (26 حوزەیران 1907) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە تەلەگرافنامەی ١١ حوزەیران ١٣٢٣ راگەیەندراوە، هاووڵاتی ئینگلتەرا مستەر کاسکی چۆتە عەمادیە و لەم دەورووبەرە لە بارەی رستن و چنین خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بووە، لە قائیمقامیەتی عەمادیە راگەیەندراوە ئەمجارە ناوبراو لە ڕێگەی رووبارەوە گەڕاوەتەوە بەغداد، لەگەڵ ئەمەش هیچ گومانێك لە جولەی نەبووە، لە قۆمیسەری پۆلیس باسکراوە و زانیاری راگەیەندراوە، فەرمان.<br>مستەفا والی موسڵ | | |





| | | |
|---|---|---|
| 9 جەمادی کۆتایی 1325 (20 تەمموز 1907) | 01143.00082 | DH.MKT |

ویلایەتی موسڵی عالی
وەڵامی نووسراوی ٧ نیسان ١٣٢٣ ژمارە ١٠ی عالیە، بۆ لێکۆڵینەوە لە هەندێك بابەت و بۆ تێپەراندنی ئەرکی بریکاری قائیمقامیەت، عەبدولکەریم ئەفەندی سەرۆکی رەشنووسی قەڵەمی مەکتوبی ویلایەتی عالی نێردراوەتە قەزای عەمادیە بە رێژەی سێ یەك مووچەی وەکالەتی بۆ دابین دەکرێت، لە وەڵامدا نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ٢٢ مایس هەمان ساڵ ژمارە ٨٧٠ دەرچووە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە.

| | | |
|---|---|---|
| 8 موحەررەم 1325 (21 شوبات 1907) | 01143.00082 | DH.MKT |

ویلایەتی موسڵی عالی
وەڵامی نووسراوی ٢٤ کانوونی یەکەم ١٣٢٢ی میهرەبانە، لەگەڵ لێکۆڵینەوەی هەندێك بابەتی گرنگ ئەرکی بریکاری قائیمقامیەت جێبەجێ دەکات، بەهائەددین ئەفەندی مومەیزی قەڵەمی مەکتوبی ویلایەتی عالی بە هەژماری سێیەك مووچەی بریکاری پێ دەدرێت، لە وەڵامی ئەم پرسەی کە کراوە، نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ٢١ کانوونی دووەم ١٣٢٢ ژمارە ٣١١٧ هاتووە، جێبەجێ کردنی بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە.




| BEO | 003056.229200 | 3 ڕەبیعی کۆتایی 1325 (16 مایس 1907) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
ئـەم مەزبەتەیـەی وێنەیەکـی لـە بـاڵا تۆمـار کـراوە، لـە فەرمانگـەی مولکیـەی شـورای دەوڵـەت بـۆ قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـەی بـەرز کراوەتـەوە، لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.

ڕێگـە دراوە محەمـەد شـوکری ئەفەنـدی قائیمقامـی پێشـووی قـەزای عەمادیـە ئەرکـی پـێ بدرێـت.



| BEO | 003070.230195 | 21 رەبیعی کۆتایی 1325 (3 حوزەیران 1907) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
نووسراو
وەڵامی نوسراوی مێژووی ٢٠ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٥ ژمارە ١١٥٧ ی دەوڵەتە، بۆ لێکۆڵینەوە لە هەندێك بابەتدا و جێبەجێ کردنی ئەرکی بریکاری قائیمقامیەت، عەبدولکەریم ئەفەندی سەرۆکی رەشنووسی قەڵەمی مەکتوبی موسڵ رەوانەی قەزای عەمادیە کراوە، هەروەها بە رێژەی سێ یەك، مووچەی وەکالەتی بۆ دابین دەکرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




BEO.003179.238358.001

| BEO | 003179.238358 | 28 رەمەزان 1325 (4 تشرینی دووەم 1907) |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>هاوپێچی نوسراوی مێژووی ٥ شەوال ١٣٢٣، عەبدولقادر پاشا موتەسەرفی عەمادیە لە مولکی شوێنگرەوە مووچەی بۆ دابین کرا بوو، لە ویلایەتی بەغداد ئاماژەی پێکراوە بۆ خێزانەکەی حەفسەخان دابین بکرێت، نووسراوی ٢٦ رەمەزان ١٣٢٥ ژمارە ٣٢٤١ی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار هاتووە، بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و ناردنەوەی. | | |



DH.TMIK.M.00273.00077.002

| DH.TMIK.M | 00273.00077 | 29 جەمادی کۆتایی 1326 (29 تەمموز 1908) |
|---|---|---|

ویلایەتی وانی عالی
بە هاندانی مارل سەرۆکی نەستوریەکانی ناو ویلایەت، سەعدی ئاغا بەرێوەبەری چاڵ، لەگەڵ عاتفی کوڕی یانەش و عەشیرەتی تاهوب رێککەوتن هێرشیان کردۆتە سەر ناحیەی بەرواری باڵای سەر بە قەزای عەمادیە، زیاتر لە ٣٠ کەسیان کوشتووە و لە هێرشەکەیان بەردەوامن، بەم راگەیاندنە هێزێکی سوارەی ٩٠ کەسی لەگەڵ ئاغای تابوری مەرکەز و موستەنتقی یەکەم و پزیشکی شارەوانی کەوتوونەتەڕێ، بۆ ئەم رووداوە سەردانی ویلایەتی عالی کراوە و لە ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە، بۆ ئەوەی رووداوی تر روونەدات چاودێری بکرێن، بە گوێرەی ئاماژەکان ئامادەکاری پێویست بکرێت و پێچەوانەی یاسا رێگە نەدرێت کارێکی نابەجێ بکرێت، ئەنجامەکەشی رابگەیەندرێت.




DH.ŞFR.00403.00105.001

| DH.ŞFR | 00403.00105 | 10 رەجەب 1326 (8 ئۆغستۆس 1908) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
هاوپێچی تەلەگرافنامەی ٢٢ تەمموز ١٣٢٤ ی بەندەیە، لە نێوان بەرواریەکان و تەیاریەکان رووبەرووبونەوە روویداوە، لە بەرواریەکان کوژراوێك و ٤ بریندار، لە تەیاریەکانیش ٤ کوژراو هەبووە، بەڵام لەسەر ئەم ئاشتەواییەی کە ئەنجام دراوە و عەشیرەتە کۆکراوەکانیش گەرێندراونەتەوە شوێنی خۆیان، تا ئێستا لە ویلایەتی وان ئامادەکاری نەکراوە و ئەم تەلەگرافنامەیەی لە قائیمقامیەتی عەمادیە و قوماندانیەتی ژاندارمە هاتووە راگەیەندراوە جارێکی تر رێگە نەدرێت ئەم جۆرە رووداوانە رووبدات، لە وەڵام بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو نووسراو کراوە، راگەیەندراوە فەرمان.
مستەفا والی موسڵ


BEO.003247.243496.001

| | | |
|---|---|---|
| BEO | 003247.243496 | 8 موحەررەم 1326 (11 شوبات 1908) |

نەزارەتی دارایی شکۆدار

هاوپێچی نووسراوی ٣٠ رەمەزان ١٣٢٥، عەبدولقادر پاشا موتەسەرفی عەمادیە مردووە، بۆ شوێنگرەوەی مولك ٥٩٩ قوروش و نیو مووچەی هەبووە، برێکی گونجاو بۆ سوحا خانی خێزانی دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لە ویلایەتی بەغداد نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە، بە دووپاتکردنەوە لەگەڵ نووسراوی ٦ موحەررەم ١٣٢٦ ژمارە ٤٤١٦ی نەزارەتی ناوهاتوو بۆ دەوڵەت رەوان کراوە، بە ناردنی جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت، هاوپێچەکانیش رەوان بکرێتەوە.




BEO.003277.245731.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>003277.245731</td><td>18 سەفەر 1326 (22 مارت 1908)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>عەبدولقادر پاشا موتەسەرفی پێشووی عەمادیە مردووە و مووچەکەی ماوەتەوە، برێك لە مووچەکەی بۆ خانمی خێزانی دابین بکرێت، ئەم مامەڵە لە ویلایەتی بەغداد کۆتایی هاتووە و لەسەر نووسراوی ٢٦ رەمەزان ١٣٢٥ ژمارە ٣٤٤١ی دەوڵەت، وەڵام لە ١٥ سەفەر ١٣٢٦ ژمارە ٤١ی نەزارەتی دارایی شکۆدار هاتووە و بە هاوپێچ بەیەکەوە بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە.</td></tr>
</table>



اوراق اوطه‌سی نومروسی — مجلس انتخاب و تسجیل مامورین علمیه — قرار نومروسی

| تاریخ تسوید | | تاریخ تبییض | | مسود | ممیز | خلاصه |
|---|---|---|---|---|---|---|
| عربی | رومی | عربی | رومی | | | |

MEŞİHAT ARŞİVİ
MŞH. SAID

| | | |
|---|---|---|
| IST.MFT.MSH.SAID | 0171.0009 | 22 زیلحیجه 1327 (4 کانوونی دووەم 1910) |

ئەنجوومەنی هەڵبژاردن و تۆماری فەرمانبەرانی زانستی

ئەحمەد حەمدی ئەفەندی نائیبی پێشووی قەزای تۆرول لە سەرەتای رەبیعی یەکەم ١٣١٣ لە تۆماری بەڕێوەبەرایەتی تۆماری نائیبەکان و ژمێریاری جیابۆتەوە، لە قۆمیسیۆنی گشتیش لە مێژووی ٢٤ سەفەر ١٣١٣ بابەتەکە نیشان دراوە، بۆ روون کردنەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت، چونکە بریاری راست کردنەوەی دراوە.



İ.DH.01478

| 10 شەوال 1327 (25 تشرینی یەکەم 1909) | 01478.000002 | İ.DH |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی ئەنجوومەنی بریکارەکان و داواکراوەکان
١٨٣٥
جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
عەلی فەهمی ئەفەندی بەڕێوەبەری جیابووەوەی حاسە لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی عالی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم



DH.MKT.02759.00067.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02759.00067</td><td>14 سەفەر 1327 (7 مارت 1909)</td></tr>
<tr><td colspan="3">لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>یەك لەسەر یەك سکاڵا لەسەر مستەفا ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە بەرز کراوەتەوە، ئەوراقی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە رەوان کراوە، نووسراوی مێژووی ١٨ کانوونی دووەم ١٣٢٤یش بە مەبەستی ووردبینی رەوانی شورای دەوڵەت کراوە.</td></tr>
</table>



| 16 جەمادی کۆتایی 1327 (5 تەمموز 1909) | 02865.00062 | DH.MKT |
|---|---|---|

جەنابی عالی پەیوەندیداری سەدارەت
لە نێوان بەرواری و عەشیرەتی تەیاری ناکۆکی و رووبەرووبوونەوە دروست بووە و بۆتە تێکدانی ئەمنیەت و ئاسایش، بە سوڵح ئاشت بکرێنەوە، دەستەی ئاشتکردنەوە کە بۆ لای عەمادیە دەچێت، لە حاجی محەمەد ئاغا نەمرون ئەفەندی ئەندامانی ئەنجوومەنی کارگێری قەزای چۆڵەمێرگ پێك دێت، بۆ ئەم ئەرکەش هەر یەکە لە ئەمانە ١٠٠٠ قوروش و سەعید ئەفەندی فەرمانبەری پۆلیس ٥٠٠ قوروش کرێیان پێ بدرێت، بۆ رەزامەندی لە ویلایەتی وان نووسراو کراوە.



BEO.003595.269595.001

| 19 جەمادی کۆتایی 1327 (8 تەمموز 1909) | 003595.269595 | BEO |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار لایەنی عالی<br>نووسراوی مێژووی ٢٢ حوزەیران ١٣٢٥ ژمارە ١٥٤١ لەلایەن عالیەوە راگەیەندراوە، لە نێو عەشیرەتی تەیاری ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بووە، بۆ ئاشت کردنەوەیان دەستەی ئاشتکردنەوە بۆ لایەنی عەمادیە رۆیشتووە، دەستەکەش لە حاجی محەمەد ئاغا ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری قەزای چۆلەمێرگ و زون ئەفەندی پێك هاتووە، بە گونجاو زانراوە بۆ هەریەکەیان ١٠٠٠ قوروش و بۆ سەعید ئەفەندی فەرمانبەری پۆلیسیش ٥٠٠ قوروش دابین بکرێت، هیممەت بکرێت. | | |

BEO.003654.274044.001

| BEO | 003654.274044 | 12 شەوال 1327 (27 تشرینی یەکەم 1909) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی سەروو<br>عەلی فەهمی ئەفەندی بەڕێوەبەری دوورخراوەی ناحیەی حاسە لە قائیمقامیەتی قەزای عەمادیەی سەر بە ویلایەتی موسڵ، دادەمەزرێت، لەسەر نووسراوی مێژووی ١٠ تشرینی یەکەم ١٣٢٥ ژمارە ٢٧٨٧ی عالی، جەنابی پاشا لە مێژووی ١٣ تشرینی یەکەم ١٣٢٧ بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |



| 22 زیلقەعدە 1327 (5 کانوونی یەکەم 1909) | 003672.275382 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی عالی
محەمەد تۆفیق بەگ دەرچووی مەکتەبی یاسا و خولەفای قەڵەمی شورای دەوڵەت لە قائیمقامی قەزای رەواعی سەر بە ویلایەتی یەمەن، داود نائل ئەفەندی وەکیلی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە لە قائیمقامیەتی لەحیە و عەبدولسەلام کەمال ئەفەندی کاتیبی فەرمانگەی ژاندارمە و خاوەن هەڵبژاردننامەی بەرێوەبەری تۆمار لە قائیمقامیەتی باجل دادەمەزرێن، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی ١٨ تشرینی دووەم ١٣٢٥ ژمارە ٣١٩٩ی عالی بە رەزامەندی لە مێژووی ٢١ تشرینی دووەم هەمان ساڵ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MUİ..00114.00063.001

| DH.MUİ | 00114.00063 | 14 رەجەب 1328 (22 تەمموز 1910) |
|---|---|---|
| وەکالەتی ویلایەتی موسڵی پایەبەرز<br>مستەفا نەجاتی ئەفەندی کە قائیمقامی قەزای عەمادیە بووە باوکی مردووە، بۆ خۆی و دایکی و کوڕ و کچەکانی بە دابەش کردن و بە زانیاری محەمەد پاشا سایونجی زادە برە پارەکە رەوانی دەرسەعادەت کراوە، کەچی ماوەی ساڵێکە ١٤٠ لیرەی عوسمانی لە هۆبەی بانقی عوسمانی موسڵ رەوان نەکراوە، داواکراوە بە پەلە جێبەجێ بکرێت، بە مۆری عەلی رزا داواکاری بۆ واڵا بەرز کراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و رەوان کردنی هاوپێچەکان. | | |



DH.İD.00123.00004.001

| DH.İD | 00123.00004 | 17 ڕەمەزان 1328 (22 ئەیلوول 1910) |
|---|---|---|
| وەکالەتی ویلایەتی موسڵ<br>لە ٦ ئەیلوول ١٣٢٦ قائیمقامی عەمادیە بەبێ مۆڵەت مەکتەبی کردۆتەوە و ئەمەش گونجاو نییە، پشت بەستن بە ووتەکان دەبێ سنوردارکردن لەلایەن ویلایەتەوە بەردەوام بێت و ڕێگە نەدرێت بەبێ مۆڵەت دووبارە مەکتەب دروست بکرێت. | | |



| 4 موحەررەم 1329 (5 کانوونی دووەم 1911) | 00053.00002 | DH.H |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ

بە گوێرەی ڕاگەیەندراوی دەفتەردار لە سندوقی دارایی عەمادیە پارە دزراوە، دوای ئەوەی ووردبینی بۆ برە پارەکە و ئەوراقی نەقدی کرا، ئەگەر بێتو دەرکەوێت ئەم پارەیە دزراوە، دەبێ بگەڕێندرێتەوە و ئەوانەی ئەم کارەیان کردووە ڕادەست بکرێن و تەمبێ بکرێن، بۆ ئەم مەبەستەش بەپەلە لێکۆڵینەوە و چاودێری دەست پێ بکات، ئەنجامەکەشی ڕابگەیەندرێت، لەسەر ئاماژەی نەزارەتی دارایی کارەکە جێبەجێ بکرێت.



| 4 شەوال 1329 (28 ئەیلوول 1911) | 00123.00004 | DH.İD |
| --- | --- | --- |
| ویلایەتی موسڵ<br>لە ٨ ئەیلوول ١٣٢٧ هەواڵ رەوان کراوە کە لەلایەن ئینگلیزەوە مەکتەب دروست دەکرێت، لە کۆتاییدا بە فەرمانی سەدری ئەعزەم تەلەگرافنامەی ١٢ ئەیلوول هەمان ساڵ هاتووە، بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکە کارەکە ئاساییە، لە بارەی بەراییەکانی بابەتەکە زانیاری و خوێندنەوەی بەپەلە رابگەیەندرێت. | | |



ŞD.02207.00004.200

| | | |
|---|---|---|
| 9 ڕەبیعی کۆتایی 1329 (9 نیسان 1911) | 02207.00004 | ŞD |
| ئـەم بـڕە پارەیـەی لـە سـندوقی دارایـی عەمادیـە داواکـراوە، دزراوە و هێشـتا قائیمقامـی قـەزای ناوهاتـوو کەموکـوری هەیـە، نـووسراو کـراوە و ئەوراقـی لێکۆڵینـەوە حەواڵـەی داواکاری گشـتی مولکیـە بـووە، تێـدا بابەتەکـە روون بۆتـەوە، بـە گوێـرەی بەرایـی ئەوراقـەکان، جێبەجێ کردنـی دراوەتـە داواکاری گشـتی ناوهاتوو. | | |


BEO.004089.306646.001

| | | |
|---|---|---|
| 17 شەوال 1330 (29 ئەیلوول 1912) | 004089.306646 | BEO |

نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
هاوپێچی نوسراوی ٢٩ ئۆغستۆس ١٣٢٨، باڵیۆزی ئینگلتەرا بە ڕێگەی عەمادیە ڕۆیشتووە، ئەمەش جێگەی مەترسیە و بە فەرمی گوێرایەڵی ئاگادارکردنەوەی ئێمە نەبووە، ٤ ی ئەیلوول بە هاوەڵی ٣ نەفەر ژاندارمە بە ڕێگەی ناوهاتوو بەرەو موسڵ بەرێکەوتووە، بە واژووی ویلایەتی وان، ئاگاداری پێشوو ڕەوان کراوە و لە وەڵامی ئامۆژگاری نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار بە نووسراو ڕاگەیەندراوە.






DH.H.00053.00041.004

| DH.H | 00053.00041 | 1 زیلحیجه 1330 (11 تشرینی دووەم 1912) |
| --- | --- | --- |

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی
هۆبەی چوارەم
٣٠٤٠
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
مەفرەزەی داهاتی قەزای عەمادیە لەلایەن باغەوانەکان تووشی رووبەروو بوونەوە بووە، بۆ تەمبێ کردنی ئەمانە ١٥٠ نەفەر زیاد کراوە و رەوانی شوێنەکە کراوە، تەلەگرافنامە لە قوماندانی لەشکری قوڵی ١٢ هاتووە و وێنەیەکی تەلەگرافنامەکە رەوان کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
بە ناوی بریکاری نازری جەنگی




DH.MB.HPS.00085.00095.002

<table>
<tr><td>DH.MB.HPS</td><td>00085.00095</td><td>6 جەمادی کۆتایی 1330 (23 مایس 1912)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>ژمارە ٦٠<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە قائیمقامیەتەکانیان بە پێویست زانراوە بۆ هەر یەکە لە گرتووخانەکانی قەزای دهۆك و زاخۆ و عەقرە و عەمادیە گاردیانێك دابمەزرێت، بۆیە جێبەجێ بکرێت و لێکۆڵینەوە رەوان بکرێت، پەیوەندیداری سەدارەت ئەمەی بە باش زانیوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>مۆری تاهیر والی موسڵ</td></tr>
</table>



ML.EEM.00941.00005.009

| ML.EEM | 00941.00005 | 22 رەجەب 1330 (7 تەمموز 1912) |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ١٣٠
نەزارەتی دارایی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

بۆ نۆژەنکردنەوە و چاککردنەوەی قۆناغی حکوومەتی قەزای عەمادیە بری ٣٥٥٦ قوروش دابین بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری ویلایەت وێنەیەکی مەزبەتەی ئەنجوومەنی کارگێری خۆجێی و ئەوراقی دەرخستە پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی پێویستی بە هاوکاری پەیوەندیداری نەزارەتە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.

والی موسڵ



ML.EEM.00956.00016.001

| ML.EEM | 00956.00016 | 11 رەجەب 1330 (26 حوزەیران 1912) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵی
قەڵەمی مەکتوب
ژمارە ١١٦
نەزارەتی دارایی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بۆ دادگای شەرعی عەمادیە ساڵانە ٦٠٠ قوروش بە ناوی شوێنگرەوە، کرێ حەواڵە دەکرێت، بەڵام لە دەرەوەی قۆناغی حکوومەت شوێنێکی گونجاو نەدۆزراوەتەوە، بۆیە بری ١٠٠٠ قوروش بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەم ژوورەی لە ناو قۆناغی حکوومەت بۆ دادگای شەرعی دانراوە دابین بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراوی نائیبی دادگای ناوهاتوو بۆ مەرکەزی نائیبی شەرعی هاتووە، هاوپێچ وەرەقەی دەرخستە و پۆستەی کەمکردنەوەی بە ئاشکرا بە ووتەی ژمێریاری ویلایەت پێشکەش کراوە، برە پارەی ناوهاتوو حەواڵە بکرێت، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بڕیاری بە دەستەوەیە.
مۆری والی موسڵ




ML.EEM.00997.00018.004

<table>
<tr><th>ML.EEM</th><th>00997.00018</th><th>22 زیلحیجە 1330 (2 کانوونی یەکەم 1912)</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دەفتەرخاقانی<br>کارگێری تۆمار<br>ژمارە ١٠٢١<br>نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>بە ووتەی بەڕێوەبەری مولکی میری، لە پەیوەندیداری نەزارەتی عالی نووسراوی مێژووی ٢٠ شوبات ١٣٢٦ ژمارە ٦٤٦٨ و ٤٨٤ نێردراوە، تێدا داواکراوە سەنەدەکانی کارگێری حکوومەتی قەزای عەمادیە و کوێستان ڕێکخراوە و بوونیان هەیە، دەفتەرەکانیان بە ژمارە ڕاگەیەندراوە، بە ووتەی سەنەدە گشتیەکانی کارگێری دەست بە نووسینی کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.<br>نازری دەفتەر خاقانی</td></tr>
</table>



BEO.004056.304156.001

| BEO | 004056.304156 | 11 رەجەب 1330 (26 حوزەیران 1912) |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
محەمەد فائیق ئەفەندی و عەلی فەهمی ئەفەندی قائیمقامی قەزای چەرکەس و عەمادیە دوور خراونەتەوە، بۆ قائیمقامیەتی چەرکەس محەمەد شوکری بەگ جیابووەوە لە قائیمقامیەتی موتیکی و بۆ قائیمقامیەتی عەمادیەش بە مووچەی چینی سێیەمی قائیمقامیەت محەمەد عەلی ئەفەندی جیابووەوە لە بەڕێوەبەری ناحیەی سەلوم دامەزرێن، لەم بارەیەوە نووسراوی مێژووی ٩ حوزەیران ١٣٢٨ ژمارە ٨٨٠ ی عالی ڕەوان کراوە، لیستی فەرمانی پاشا لەگەڵ واژووی جەنابی پاشای هومایۆن پەسەند کراوە، هاوپێچ وێنەی پەسەند کراوی بەرز کراوەتەوە، هیممەت.



DH.SYS.00025.00112.001

| DH.SYS | 00025.00112 | 19 زیلحیجە 1331 (19 تشرینی دووەم 1913) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
لە ١٦ تشرینی یەکەم ١٣٢٩ داهات بە تەواوەتی وەربگیرێت و بۆ خەزینەی داهات ڕەوان بکرێت، بۆ ئەم کارەش هێزی سەربازی ڕەوانی قەزاکانی عەمادیە و عەقرە و دەورووبەری دەکرێت، بری خەرجی دابین دەکرێت، بۆ دەفتەردار نووسراوەتەوە و بە نەزارەتی دارایی ڕاگەیەندراوە.



DH.MEM.00142.00020.001

| DH.MEM | 00142.00020 | 4 جەمادی کۆتایی 1331 (11 مایس 1913) |
|---|---|---|

لەبارەی قائیمقامیەتی عەمادیە
تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ٢٨ نیسان ١٣٢٩ مامەڵەی قائیمقامیەتی عەمادیە لە پۆستەیە، بە ناردنی راپۆرت بۆ ووردبینی کراوە، دواتر رادەگەیەندرێت.




DH.MEM.00150.00069.020

| DH.MEM | 00150.00069 | 28 جەمادی کۆتایی 1331 (4 حوزەیران 1913) |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی مەکتوب<br>ژمارە ٢٨<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە تەلەگرافی مێژووی ٢١ نیسان ١٣٢٩ راگەیەندراوە، بەهۆی بارودۆخی تەندروستی محەمەد عەلی ئەفەندی قائیمقامی عەمادیە، ئیستیدعا نامە و راپۆرتی پزیشکی هاوپێچ پێشکەش کراوە، جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت بفەرمووێت تا هاوکاری بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.<br>مۆری والی موسڵ | | |



DH.MEM.00157.00066.004

| DH.MEM | 00157.00066 | 10 رەمەزان 1331 (13 ئۆغستۆس 1913) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی مەکتوب
٨١
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئاسف ئەفەندی بریکاری قائیمقامی عەمادیە لە وەکالەتی ناوهاتوو ماوەیەکی کەم ماوەتەوە، بەڵام بۆ سەقامگیر کردن و بەهێزکردنی ئەمن و ئاسایشی قەزاکە خەرجی دابین کراوە، بەهۆی هەوڵ و کۆششی لە قائیمقامیەت لەلایەن سەرکردەکانەوە دوو تەلەگرافنامە لە پایەی ویلایەت دەرچووە و پێشکەشی پەیوەندیداری نەزارەت کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە بریاری بەدەستەوەیە.
مۆری ئەسعەد میری لیوا بریکاری والی موسڵ

| DH.İD | 00169.00003 | 17 جەمادی کۆتایی 1331 (24 مایس 1913) |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>لە ٢٨ نیسان ١٣٢٩ بۆ دامەزراوەی نوێ دەرماڵە وەرگیراوە، بە تێروانین لە کردنەوەی مەرکەزەکانی قەزای عەقرە عەمادیە و سنجار، وەڵام دراوەتە نەزارەتی تەلەگراف. | | |

| DH.İD | 00169.00003 | 9 جەمادی یەکەم 1331 (16 نیسان 1913) |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>لە ٢٥-٢٦ مارت ١٣٢٩ بۆ دامەزراوەی نوێ لێرە دەرماڵە نییە، هەرچی کردنەوەی مەرکەزەکانی سنجار و عەمادیەیە، بە پێویست زانراوە رۆژی کردنەوەی مەرکەزەکانی تەلەگراف وەکو خۆی بەجێ بهێڵدرێت، لە نەزارەتی تەلەگراف راگەیەندراوە. | | |

| DH.İD | 00169.00003 | 1 جەمادی یەکەم 1331 (8 نیسان 1913) |
|---|---|---|
| بەپەلەیە<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>هاوپێچی تەلەگرافنامەی ٢٥ مارت ١٣٢٩ یە، بۆ جێبەجێ کردن و تەواو کردنی هێڵی عەمادیە لە خۆجێی پارە دابین دەکرێت، بۆ دڵنیاییکردنەوە راگەیەندراوە، بەپەلە وەڵام بدرێتەوە.<br>والی موحەررەم | | |




ML.EEM.00997.00018.006

<table>
<tr><td>ML.EEM</td><td>00997.00018</td><td>4 ڕەبیعی یەکەم 1331 (11 شوبات 1913)</td></tr>
<tr><td colspan="3">ژمارە<br>٩٥٤٩ گشتی<br>١١٤٨ تایبەت<br>نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢٧ تشرینی دووەم ١٣٢٨ ژمارە ٣٤/٥٣٤٥ ی بریارنامەی پەیوەندیداری نەزارەتە<br><br>سەبارەت بە قۆناغی حکوومەتی قەزای عەمادیە و کوێستان و گشت بابەتەکانی تر لە تابۆی خۆجێی تۆمار دەکرێت، هەرچی قەزای ناوهاتووە ئەمرۆ بەستراوەتەوە بە ویلایەتی موسڵی شکۆدار، تۆماری گشت بابەتەکان و قۆناغی ناوهاتوو و کوێستان لە ویلایەتی ناوهاتوو داواکراوە، بەم راگەیاندنە کارەکە جێبەجێ بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>مۆری دەفتەرداری وان</td></tr>
</table>




| DH.MEM | 00167.00048 | 23 موحەررەم 1332 (22 کانوونی یەکەم 1913) |
|---|---|---|

عەزیز بەگ قائیمقامی مەرکەزی ئەدرنە بە سێیەکی مووچەکەی بە وەکالەت لە موتەسەرفیەتی گلیبۆڵو دادەمەزرێت، محەمەد عەلی ئەفەندی قائیمقامی عەمادیە و عەبدولمەجید ئەفەندی قائیمقامی گوڵعەنبەر بەم مووچەی کە وەریدەگرن گۆڕینەوەیان پێ بکرێت، بە دوور خستنەوەی تۆفیق بەگ قائیمقامی کۆپریش عەبدولستار بەگ قائیمقامی ڕەشادیە بگوازرێتەوە و دادەمەزرێت، بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان دراوە.

لە باڵا ڕێنمایی ئاماژەی پێکراوە، بە ڕاگەیاندنی نووسراوی ناوهاتوو لە بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی بۆ والا بەرز کراوەتەوە.

DH.İD.00169.00011.021

| DH.İD | 00169.00011 | 25 زیلقەعدە 1332 (15 تشرینی یەکەم 1914) |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵی عالی<br>وەڵامی نووسراوی ٥ حوزەیران ١٣٣٠ عالییە، بە پێویست زانراوە هێڵی تەلەگرافی قەزای عەمادیە و مەرکەزی ویلایەت درێژ بکرێتەوە، بۆ دابین کردنی خەرجیەکەشی لە بودجەی ١٣٣١ تۆمار کراوە، لە کاتی پەسەند کردنی، جێبەجێ دەکرێت، لە وەڵامی نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی شکۆدار نووسراو کراوە. | | |


İ.MMS.00177

I.MMS 177/7

<table>
<tr><th>İ.MMS</th><th>00177.00007</th><th>18 ڕەبیعی یەکەم 1332 (14 شوبات 1914)</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>قەڵەمی ئەنجوومەنی بریکار و داواکراوەکان<br>٣٣٣٥<br>فەرمانی پاشا<br>ناحیەی نیروە سەر بە قەزای عەمادیەی ویلایەتی موسڵ هەڵبوەشێتەوە و گوندەکانی سەر بەم ناحیەیە بە ناحیەی ڕێکان ببەسترێتەوە، هەروەها گوندی لەهیبیش بکرێتە مەرکەز، لەلایەکی تر ناحیەی ئیمام عەلیل دابمەزرێت و ئەم گوندانەی ناویان تۆمار و دیاریکراوە بە ناحیەی ئیمام عەلیل ببەسترێتەوە، بە بریاری ئەنجوومەنی بریکارەکان جێگیر کراوە.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.</td></tr>
</table>


MEŞİHAT ARŞİVİ
MŞH. SAİD

| IST.MFT.MSH.SAID | 0189.0014 | 15 زیلحیجە 1332 (4 تشرینی دووەم 1914) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی مەکتوب
٣٥ تایبەتی
جەنابی پەیوەندیداری مەشیخەتی پاشا
راگەیەندراوی بەندەمانە
وەڵامی تەلەگرافنامەی مێژووی ١٢ نیسان ١٣٣٠ پەیوەندیداری فەتوایە، بۆ موفتی قەزای عەمادیە لە خۆجێی هەڵبژاردن کراوە و ئەوراق لە قائیمقامیەت رەوان کراوە، لەم هەڵبژێردراوانە ئەحمەد ئەفەندی کوڕی زانا ئەسعەد ئەفەندی زادە جێگەی باوەر پێکراوە و بە ئاماژەی قائیمقامیەت جێگەی متمانەیە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
والی موسڵ



| IST.MFT.MSH.SAID | 0189.0017 | 29 رەجەب 1332 (23 حوزەیران 1914) |
|---|---|---|
| جەنابی پەیوەندیداری فەتوا<br>راگەیەندراوی داعیمانە<br>وەرەقەی وەرگێردراوی کەسێتی محەمەد تەیب ئەفەندی مودەریسی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی موسڵی شکۆدار بە هاوپێچەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بریار دراوەتە لایەنی پەیوەندیدار، لە هەر حاڵەتێکدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بە دەستەوەیە.<br>مۆری محەمەد شەوقی قازی عەمادیە | | |




DH.İD.00192.2.00024.002

| DH.İD | 00192.2.00024 | 26 رەبیعی کۆتایی 1332 (24 مارت 1914) |
|---|---|---|
| نەزارەتی داد و مەزهەبەکان<br>قەڵەمی تایبەت<br>ژمارە ٤١<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەلایەن یاریدەدەری سەرپەرشتیاری دادی موسڵ لیستی مامەڵەی سەرپەرشتیاری دادی قەزای عەمادیە هاتووە، ئەم ئەوراقانەی لە فەرمانگەی ژاندارمەی دادی قەزای ناوهاتوو رەوان کراوە و تۆمار کراوە، ئەوەی پێویستە لەم دەفتەرانە هیچ یەکێکی نەپارێزراوە، مامەڵەی جێبەجێ کردنیش بە شێوەیەکی ئاشکرا و بە دەست پەسەند دەکرێت، دەبێ مامەڵەی داد و جێبەجێ کردنی ئەوراقی فەرمی لە وون بوون بپارێزرێت و دەفتەرەکان رێك بخرێن، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>راوێژکار بە ناوی نازری داد | | |




| MV | 0189.0017 | 15 ڕەبیعی یەکەم 1332 (11 شوبات 1914) |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی ناوەخۆ<br>لیستی فەرمانی پاشا<br>بە هەڵوەشاندنەوەی ناحیەی نیروە سەر بە قەزای عەمادیەی ویلایەتی موسڵ، دەرماڵەکانی دەمێنێتەوە، هەروەها لە بەرامبەر ئەمەدا گوندی لەهیب دەکرێتە مەرکەز و ناحیەیەکی تر بە ناوی ناحیەی حەمام عەلیل دامەزراوە.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە.<br>نازری ناوەخۆ/سەدری ئەعزەم | | |




DH.SN.M..00235.00072.001

| DH.SN.M | 00235.00072 | 25 ڕەبیعی کۆتایی 1332 (23 مارت 1914) |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>ژمارە ١١<br>جەنابی پاشا تۆماری ناسنامەی بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی<br>جەنابی میهرەبانی ئەفەندم<br>بریار و فەرمان ڕێکخراوە و بەرز کراوەتەوە، خشتەکانی ئاماری گشتی قەزای عەمادیە سەر بە مەرکەزی سانجەق لەگەڵ پارچەیەك خشتەی ئامار ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.<br>مۆری میر ئەحمەد محەمەد بەڕێوەبەری ناسنامەی موسڵ | | |


İ.DH 1504/1332.M/15
14

İ.DH.01504

| İ.DH | 01504.000014 | 12 موحەررەم 1332 (11 کانوونی یەکەم 1913) |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران
ژمارە ٢٥٢٣
فەرمانی پاشا
محەمەد عەلی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە و عەبدولمەجید ئەفەندی قائیمقامی قەزای گوڵعەنبەر بەم مووچەی وەریدەگرن گۆڕینەوەیان پێ بکرێت.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نەزارەتی ناوەخۆ ئەرکی پێدراوە.
نازری ناوەخۆ/سەدری ئەعزەم




شورای دولته مخصوص مسوده ورقه‌سی

| نومرو | مسودی | تاریخ تسوید | | تاریخ تبییض |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |



ŞD.02209.00016.002

| ŞD | 02209.00016 | 21 زیلقەعدە 1332 (11 تشرینی یەکەم 1914) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>محەمەد عەلی ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای گوڵعەنبەر ئەم کاتەی لە قائیمقامیەتی عەمادیە بووە، بابەتی جۆراوجۆری خراوەتە پاڵ، بەڵام بۆ رێگەگرتن لە دادگاییکردنی ناوبراو، مەزبەتە لە فەرمانگەی مولکیە و مەعاریف رێکخراوە لەگەڵ بەراییەکانی بۆ ویلایەتی موسڵ نێردراوە تا بۆ پەیوەندیداری نەزارەت بەرز بکرێتەوە. | | |

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
4239 317887

BEO.004239.317887.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>004239.317887</td><td>14 موحەررەم 1332 (13 کانوونی یەکەم 1913)</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢٦ تشرینی دووەم ١٣٢٩ ژمارە ١٥٨٨ ی عالیە، محەمەد عەلی ئەفەندی قائیمقامی قەزای عەمادیە و عەبدولمەجید ئەفەندی قائیمقامی قەزای گوڵعەنبەر گۆرینەوەیان پێ دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی بۆ دەوڵەت رەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>



باب عالی
داخلیه نظارتی
ادارهٔ عمومیهٔ داخلیه مدیریتی
عمومی
خصوصی
(شیفره)
چالده موصل والی وکیلی حیدر بك افندیه


DH.ŞFR.00056.00279.001

| DH.ŞFR | 00056.00279 | 25 زیلقەعدە 1333 (4 تشرینی یەکەم 1915) |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی کارگێری ناوەخۆی گشتی<br>بۆ حەیدەر بەگ ئەفەندی بریکاری والی موسڵ لە چاڵ<br>لە ١٣ ئەیلوول ١٣٣١ بە شێوەیەکی کاتی کارگێری قەزای چۆڵەمێرگ بە موسڵ بەستراوەتەوە، هەروەها بەهۆی شەڕەوە بە شێوەیەکی کاتی ناحیەی چاڵی بە عەمادیە ببەسترێتەوە.<br>بە ناوی نازر | | |

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف ادارهسی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

داخلیه نظارتنه

موصل والی وکیلی

حمید

DH.ŞFR 476/23

DH.ŞFR.00476.00023.001

| 5 شەعبان 1333 (18 حوزەیران 1915) | 00476.00023 | **DH.ŞFR** |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆ<br>هاتومەتە عەمادیە و عەشیرەتی بەرواریشم نارد، بەیانی خۆشم دەچمە بەرواری.<br>حەیدەر بریکاری والی موسڵ | | |


İ.TAL.00499.00030.002

| | | |
|---|---|---|
| 25 ڕەبیعی یەکەم 1333 (12 مارت 1915) | 00499.00030 | İ.TAL |

نەزارەتی جەنگی
فەرمانگەی تۆمار
قەڵەمی تۆمار
٢٧٤٥
فەرمانی پاشا
لە کاروباری سەفەربەرليك خزمەتی رەشید بەگ سەرۆکی بەرواری باڵا لە قەزای عەمادیە بینراوە، بۆ ئەمەش لە پلەی پێنجەم نیشانێکی مەجیدی پێ دراوە.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە نازری جەنگی ئەرکی پێ دراوە.
بریکاری باش قوماندان/ سەدری ئەعزەم


باب عالی
داخلیه نظارتی

BAŞBAKANLIK
ANLI ARŞİVİ

İ.DH.1511/1333M/41
41

İ.DH.01511

| İ.DH | 01511.000041 | 28 موحەررەم 1333 (16 کانوونی یەکەم 1914) |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی ناوەخۆ
فەرمانی پاشا
مەرکەزی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی موسڵ گوازراوەتەوە بۆ گوندی بیبان.

بە فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی جێبەجێ کردنی ئەم کارەی پێ سپێردراوە.
نازری ناوەخۆ/ سەدری ئەعزەم




| 1 سەفەر 1333 (19 کانوونی یەکەم 1914) | 004327.324461 | BEO |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی ٢ کانوونی یەکەم ١٣٣٠ ژمارە ١٤٤٤ ی عالیە، مەرکەزی قەزای عەمادیە سەر بە ویلایەتی موسڵ بۆ گوندی بیجاد بگوازرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی بۆ لایەنی عالی بەرز کراوەتەوە، جێبەجێ بکرێت. | | |

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.MB.HPS.00115.00034.001

| DH.MB.HPS | 00115.00034 | 29 سەفەر 1334 (6 کانوونی دووەم 1916) |
| --- | --- | --- |
| گرتووخانەی عەمادیە لە رووی تەندروستییەوە گونجاو نییە، بۆیە خەرجی دروست کردنی گرتووخانەیەك دیاری کراوە و بڕی ٢١٠١ قوروش دابین کراوە، بەڵام لە هاوپێچی نووسراوی دەرخستە لاری بوونی نیشان نەداوە، چونکە لە ناو پلان نەبووە، بە گوێرەی دەرخستەکە داوا کراوە بینایەیەکی کۆن نۆژەن بکرێتەوە و بکرێتە گرتووخانە، ئەمەش شایانی قەبوڵ کردن نییە. | | |




ML.EEM.01209.00016.002

| ML.EEM | 01209.00016 | 23 زیلقەعدە 1334 (21 ئەیلوول 1916) |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی مەکتوب
نەزارەتی دارایی شکۆدار
جەنابی نازر بەگی ئەفەندی
لە بارەی نۆژەنکردنەوەی قۆناغی حکوومەتی عەمادیە، دەرخستە لە قائیمقامیەتی خۆجێی رەوان کراوە، بە ووتەی ژمێریاری ویلایەت هاوپێچ پێشکەش کراوە و ٥٥٠٥ قوروش رێکخراوە، بە ناردنی حەواڵەنامە هاوکاری بکرێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمانی بەدەستەوەیە.
حەیدەر والی موسڵ




DH.ŞFR.00099.00178.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR</td><td>00099.00178</td><td>12 شەعبان 1337 (13 مایس 1919)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>قەڵەمی تایبەت<br>٥٥٥٣<br>ویلایەتی وان<br>٦ مایس ١٣٣٥، بۆ ئەوەی عەشیرەتەکانی ناو ویلایەت لەگەڵ عەشیرەتەکانی عەمادیە و زاخۆ سەرپێچی هاوبەش و ڕێککەوتن نەکەن، پێویستە هۆکارەکانی بخرێتە ژێر دڵنیاییەوە.<br>نازر</td></tr>
</table>



DH.ŞFR.00103.00089.001

| DH.ŞFR | 00103.00089 | 13 زیلحیجە 1337 (9 ئەیلوول 1919) |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>قەڵەمی تایبەتی<br>٧٧٨٩<br>ویلایەتی وان<br>لە ١١ ئۆغستۆس ١٣٣٥، گوایە زیاتر لە ١٥٠٠ سوارەی ئەرمەنی چوونەتە پاڵ ئینگلیز و عەشیرەتەکانی عەمادیەیان شکست پێ هێناوە، بەشێك خۆیان رادەست کردووە و بەشەکەی تریش بۆ لای وان هیجرەتیان کردووە، لە ئاماژەی قائیمقامیەتی شرناخ بە ویلایەتی بەتلیس راگەیەندراوە و گرنگی مەسەلەکە ئاماژەی پێکراوە.<br>نازر | | |




مالیه نظارتی

مخصصات ذاتیه مدیریتی

درسعادت

خلاصه

ملفوف

عدد



DH.MEM.00366.00011.001

<table>
<tr><th>DH.MEM</th><th>00366.00011</th><th>20 سەفەر 1337 (25 تشرینی دووەم 1918)</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دارایی<br>بەڕێوەبەرایەتی دەرماڵەی خۆیەتی<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی ٨ تشرینی یەکەم ١٣٣٤ ژمارە ٣٤٧١٩٩ ی عالیە، لە هۆبەی سوڵتان ئەحمەد بە ژمارە ٥٧١٣ تۆمارکراوە، عەلی فەهمی ئەفەندی قائیمقامی پێشووی قەزای عەمادیە مووچەی خانەنشینەکەی ٥٧٢ قوروش بووە، لە ناوچەی ئاق بیق شەقامی ئاحورقەپو خانەی ژمارە ٣ نیشتەجێ بووە، ڕاگەیەندراوە جەنابی ئەفەندم.<br>بە ناوی نازری دارایی</td></tr>
</table>




باب عالی
داخلیه نظارتی
شیفره قلمی

شیفره تلغرافنامه

مخرجی: دیاربکر

تاریخ کشیده سی: ۸ مارت ۳۳۵
قلمه ورودی: ۹ مارت

صباح د س — اقشام د س

ذیل ۲۷ شباط ۳۳۵ اخیراً ماردینه متصرفلغنه آلنان تلغرافده عمادیه قائمقامی شفیق و رواندز قائمقامی مسعود بکلرك جزیره قضاسنده بولندقلری اشعار قلنمقله عرض اولنور
۸ مارت ۳۳۵

والی وکیلی
مصطفی نادر



DH.MEM.00383.00030.002

| 5 جەمادی کۆتایی 1337 (8 مارت 1919) | 00383.00030 | DH.MEM |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>قەڵەمی شیفرە<br>هاوپێچ ٢٧ شوبات ١٣٣٥ ئەم تەلەگرافنامەیەی لە موتەسەرفی ماردین وەرگیراوە، شەفیق بەگ قائیمقامی عەمادیە و مەسعود بەگ قائیمقامی رەواندز لە قەزای جەزیرەن، ئاماژەی پێکراوە و راگەیەندراوە.<br>مستەفا نادر وەکیلی والی | | |



DH.ŞFR.00106.00070.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR</td><td>00106.00070</td><td>25 ڕەبیعی کۆتایی 1338 (17 کانوونی دووەم 1920)</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی گشتی عەشیرەت و پەنابەران<br>لە ٤ کانوونی دووەم ١٣٣٦ فەرمانبەرانی ویلایەت سەرقاڵترن، بۆیە سەرپەرشتیاری عەمادیە وەکو فەرمانبەرانی هاوشێوەی خۆی و بە گوێرەی ڕێنمایی مووچەکەی ڕێک بخرێت.<br>بە ناوی نازر</td></tr>
</table>




| BEO | 004602.345122 | 3 ڕەبیعی یەکەم 1338 (26 تشرینی دووەم 1919) |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٢٢ تشرینی دووەم ١٣٣٥ ژمارە ١٧٩٠ی دەوڵەتە، عەبدولمەجید ئەفەندی قائیمقامی خانەنشین کراوی عەمادیە لە قائیمقامیەتی چباقچور دامەزرێت، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەندکراوی بۆ عالی بەرز کراوەتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |

# السيـرة الـذاتـيـة

## د. نوزاد يحيى سعيد خدر ألياس محمد باجگر

1) ولد في 28 شباط 1948 م.

2) بكر الوالدين يحيى سعيد باجكر و مكيه أحمد صمد سعدالله و لي ثلاث اشقاء وأربعه شقيقات.

3) درست الابتدائية في مدرسة الفيصلية ثم أربيل الاولى .. إبن خلكان. باللغة الكردية و معلمي الاول استاذ ناصح داود و فؤاد معلم الرسم.

4) ثم دراسة المتوسطة في متوسطة أربيل و مدرسي الاول استاذ مكى.

5) ثم اعدادية في اعدادية أربيل ومدرسي الاول الاستاذ خليل عبدالله.

6) دخـلـت جامعة مـوصل - كـلـيـة طــب خـريـف 1967 .

7) تخرجت طبيباً عاماً 1973-1974 م.

8) تـعينت طـبيباً مـقيماً 1974 - 1975 و رئـيس الاطـباء المقيمون . يعتبر من أحلى سنوات عمري .

9) شاركت في مؤتمر التأسيس لاتحاد كتاب الاكراد في بغداد 1970 - 1971.

10) التحقت بالخدمة العسكرية اللازمية 1975 - 1976 جندي طبيب. وخدمت في قوات الحدود في زاخو .. أربيل و رواندوز .

11) قضيت طبيب قرى والارياف في كلاله من احلى أيام عمري 1976 - 1977 .

12) طبيب ممارس عام مستوصف سيتاقان .

13) طبيب طواري في مستشفى أربيل الجمهوري.

**14) طبيب متدرب في جراحة الصدر والقلب والاوعية الدموية وفتحت العيادة الخاصة مساءً.**

**15) فتح أول مركز لجراحة الصدر والقلب والاوعية الدموية في كوردستان أربيل مع د. وليد خالد في مستشفى أربيل الجمهوري سنة 1982.**

**16) نقل ملاكي من وزارة الصحة الى وزارة التعليم العالي كلية الطب جامعة صلاح الدين في 1982.**

**17) تنسيب لتدريب جراحة القلب والصدر في مدينة الطب بغداد . تحت رعاية استاذ يوسف النعمان 1983 .. ودراسة الاختصاص في جراحة الصدر والقلب 1983 - 1987 في جامعة بغداد كلية الطب - مدينة الطب الطابق التاسع، سنتان تقويميتان و سنتان دراسة و تدريب.**

**18) منحت لقب طبيب جراح اختصاص بعد إتمام دراستي العليا في مدينةالطب - كلية الطب جامعة بغداد في تشرين الاول 1987 .**

19) رجعت الى أربيل طبيب جراح اختصاص جراح القلب والصدر كلية الطب جامعة صلاح الدين.

20) وجراح اختصاص في مستشفى صدام التعليمي في أربيل 1987 - 1988 .

21) نقلت الى كلية الطب جامعة مستنصرية مستشفى يرموك , فتحت العيادة الخاصة في بغداد. شارع مشجر .. عماده باقر الباقر. 1988 - 1996 .

22) مارست الرسم في شقتي الخاصة في مجمع سولي على البحر المتوسط حيث رسمت 69 لوحة تشكيلية . مرسمي الخاص. و كتبت كثير من الشعر الحر الكردي والعربي .

23) رجعنا 2003 الى الديار في أربيل وتوسع نشاطات الخدمات التجارية والخدمية و التعليمية لكافة مدن كوردستان والعراق.

24) تنشيط الحركة الاقتصادية والاستثمار لكردستان والعراق.
25) إنشاء شركات عالمية في دبي , مرسين , عراق , سريلانكا و انكلترا.
26) تأسيس جامعة جيهان – أربيل 2007 م.
27) تأسيس بنك جيهان للاستثمار 2009 في العراق.
28) تأسيس جيهان للابتدائية والمتوسطة والاعدادية.
29) رئيس مجلس الادارة لشركة جيهان للاعمار.
30) رئيس مجلس الادارة لشركة جيهان للخدمات النفطية.
31) رئيس مجلس الادارة لشركة جيهان للتأمين.
32) تأسيس اذاعة وتلفزيون جيهان 2008 أربيل .
33) تأسيس جامعة جيهان سليمانية 2011 .
34) تأسيس جامعة جيهان في دهوك 2013.
35) تأسيس مركز البحوث والاستشارات العلمية والقانونية للقتل الجماعي.
36) تأسيس نادي جامعة جيهان الرياضي 2010.
37) عضو جمعية جراح القلب العالمي.
38) عضو جمعية جراحي القلب الاسيوية.
39) عضو في نقابات الاطباء . الصحفين وغرف التجارة.
40) مؤسس جمعية الرفق بالحيوان.
41) مؤسس جمعية حماية البيئة.
42) صاحب امتياز مجلة جامعة جيهان .
43) صدر له عشرة كتب هي (أزرع الكلمات , ووشة دةضيَنم , الله, الموت مع الالبوم فن التشكيلي.

44) كتب تحت الطبع و هي: ( السلام )، يقول المعلم، ليلى، الفكر.

45) رئيس مجلس الامناء جامعات جيهان ( أربيل، سليمانية، دهوك ) .

46) من مؤسسي اتحاد مستثمرين كوردستان.

47) من مؤسس سوق الأوراق المالية في أربيل ESX .

48) عضو منظمة السلام العالمي.

49) مشاريع مستقبلية:

أ- مشروع فتح جامعات في الدول الفقيرة. صومال، بنكلاديش وذالك لتواصل الثقافي والعلمي بين الامم.

ب- فتح جامعات في كافة مدن الكبيرة في العراق.

ج-التعليم هو الحل والسلام هو النتيجة.

د- تدريس حقوق الطفل والمرأة في مدارس والجامعات.

هـ- نشر مبدء نبذ العنف الاسرة.المرأة ، الطفل.

و- انشاء مستشفى جيهان التعليمي و لاحقاً فتح كليات الطب والصيدلية, والاسنان والتمريض.

عـــمـــري 76 ســنـــة. جــراح استشاري، رســام، شــاعر، رجــل الاعــمـــال ..